# شۆڕشی برایم خانی دەلۆ

# لە

# بنج و بناوان و لق و پۆپەوە

مصطفی نەریمان

چاپی دووەم

٢٠٠٧

ناوی کتێب : شۆڕشی ئیبراهیم خانی دەلۆ / ١٩٢٠

نووسینی: مصطفی نەریمان

تایپ: اخلاص قادر

دیزاین : هۆشەنگ عەونی

ژمارەی سپاردن:( ٥٩٢ ) لە کتێبخانەی نیشتمانی - بەغدا

چاپی یەکەم :١٩٨٦ دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی

چاپی دووەم : ٢٠٠٧ چاپخانەی رۆژ - کەرکوك

## چاپکردنی ئەم کتێبە بۆ چی؟

کتێبی (شۆڕشی ئیبراهیم خانی دەلۆ ١٩٢٠) کە لە نوسینی مامۆستا (مستەفا نەریمان)ە، سەردەمێکی زیندووی خەبات و بەرخودانی میللەتی کوردمان لە ناوچەی گەرمیان و بەتایبەتیش لە شاری کفری وەبیر دێنێتەوە. خەڵکی ئەو ناوچەیە هەردەم هاوەڵی شۆڕشەکانی کورد بوون, گیانی کوردایەتی بۆ ساتەوەختێکیش لە گەرمیاندا لاواز نەبووە, دەکرێت بە تەعریفی ئەمڕۆ بڵێین ئیبراهیم خانی دەلۆ پیاوێکی خوێندەوار نەبووە بەڵام ئەوەی ئەم کتێبە بخوێنێتەوە ئامادە نییە بەو وەسفە (ئیبراهیم خان) بێنێتە پێش چاوی خۆی, لەبەر ئەوە دووبارە چاپکردنەوەی ئەم کتێبە زەرورەتێکی مێژووییە بۆ ئەوەی واقیعی سیاسی و کۆمەڵایەتی و کلتوری سەردەمی (ئیبراهیم خانی دەلۆ) بە نەوەکانی ئەمڕۆ و دوارۆژ بگەیەنین.

ناکرێ میرخاسی و کوردایەتی خەڵکی گەرمیان لە ناوچەی (کفری)دا سنووردار بکەین، بەڵام ئەو ریوایەت و بەڵگەنامانەی لەم کتێبەدا ئاماژەی بۆ کراوە، ئەو ناوانەی لە بەشەکانی کتێبەکەدا هاتووە ئاماژەیەکی ڕوون و ئاشکرایە بۆ قارەمانێتی و مێژووی پڕ سەروەری خەڵکی شاری کفری و دەوروبەری، لەم کتێبەدا پێکهاتەی دانیشتوانی شاری کفری لەو سەردەمەدا بە شێوەیەکی واقعی و راستگۆیانە تەرح کراوە و ئاستێکی باش لە مەوزوعیەتی نووسینەوەی مێژووی ئەو دەفەرەشی پێوە دیارە، نوسەر لەم کتێبەدا جگە لەوەی پشتی بە سەدان سەرچاوە و شایەت حاڵ بەستووە، هەوڵیداوە هەڵکەوتەی جوگرافی و دیموگرافیای شاری کفری و ئەو شار و شارۆچکە و گوندانەی کە لە دەوروبەریدان بۆ خوێنەری ئاشکرا بکات کە ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی جگە لە مەغزا سیاسیەکەی ئامانجێکی کۆمەڵایەتی و ئاینیش بپێکێت و تام و چێژێکی بە خوێنەری کتێبەکەداوە، ئەو پێنج بەشەی کە کتێبەکەی بەسەر دابەشکراوە بەشێکیان تایبەت کراوە بە

پەیوەنـدی نێـوان هـۆز و بنەماڵـەکانی کفـری و دەوروبـەری و ئاگـامی ئـەو پەیوەندیانەش لەسەر هەردوو رەوشی ئابووری و سیاسی و کۆمەلایەتی باسکراوە، هـەروەها لـە کتێبەکـەدا ژمارەیـەکی زۆر لـە نـاوی کـە سـایەتیە ئـایینی و کۆمەلایتیەکان هاتووە کە لەو سنوورەدا پێگەو رۆڵی خۆیان هەبووە و لە پاڵ ئەمانەشدا شێوازی حوکمرانی ناوچەکە و ئەو بەرپرسانەی کە لە شاری کفریدا کاریـان کـردووە بـە شـێوەی ریزبەنـد هـاتووە و دەکرێـت بڵـێین لـە کتێبەکـەدا مێژوویـەکی کـورت کـراوەی هـەموو شـاری کفـری و کەسـایەتی و عەشـیرەتەکانی ناوچەکە ئاماژەی بۆ کراوە و جێگیر کـراوە، هەروەها لە کتێبەکـەدا گرنگی رۆڵی تەریقەت و زانایانی ئایینی و پەیوەندیـە کۆمەلایەتیـەکانی ناوچـەکە باسکراوە و هەنـدێك لـە تایبەتمەنـدی (ئیـبراهیم خـان) و بنەماڵەکـەی خراوەتـە روو کـە مەبەسـت تیایـدا پاراسـتنی مێژوویـەکی راسـتەقینەیە و هـەرگیز هەسـت ناکـەی شـێوازی پیاهەڵـدان و رِیـایی لـە کتێبەکـەدا هـەبێت، لـە بەشـێکی کتێبەکـەدا هەڵوێستی جەماوەری شاری کفری لـە بەرامبـەر داگیرکەرانـدا بـە دیـار خـراوە کـە تیایدا پشتگیری خەڵکی ئەم ناوچەیە بۆ شۆرِشـی ئـازادیخوازی و ئـەو قوربانیانـەی کە لە پێناو ئازادیدا دراوە زۆر بە روونی باسکراوە.

دەکرێـت بڵـێین چـاپکردنەوەی ئـەم کتێبـە لـەم بارودۆخـەدا گرنگیـەکی مێژوویی و سیاسی هەیە و راستیەکانی مێژووی کورد لە ناوچەیەکی هەسـتیاری کوردستاندا، دەخاتەوە پێش چاوی خوێنـەر و هەنـدێك لەو راستیانەش بـە دیـار دەخاتـەوە کـە بـەهۆی بـارودۆخی سیاسـی و ئـابووری شـێوابوو رەنگـە ئـەوەی ئـەم سەردەمە کەمێك بە زەحمەت لە ناوەرِۆك و ئامانجی بە چاپ گەیانـدنی کتێبەکـە لەوسەردەمەدا تێبگات، بەلام بە خوێندنەوەی تەواوی کتێبەکە کۆمـەڵێك رەهەنـد و بـەهای گـرنگ دەسـت خوێنـەر دەکـەوێت کـە بەشـێکی زۆر لـە نووسـەر و رووناکبیرانی کـورد بـە دوایـدا دەگـەرِێن، لێـرەدا بـە پێویـستی دەزانم دەور و ماندووبوونی مامۆستا (نەریمان – مستەفای سەید ئەحمەدی بەرزنجی) نووسەر و

رۆژنامە نووس و مامۆستا بخەمە روو لەبەر ئەو هەموو دڵسۆزی و ماندووبونـەی بۆ ساغ کردنەوەی راستی رووداوەکان و روونکاریەکانی، مامۆستا نەریمان لە ماوەی ٤٠ ساڵدا کۆمەڵێك بەرهەمی بە سوود و بە پێزی پێشکەش بـە بزافـی رۆشنبیری کوردی کردووە، مێژووی نزیکی گەرمیانی وەکو خۆی تۆمـار کـردووە دەقـاو دەق و تایبەتمەندیەکانی و ووردەکارییەکانی بۆ خوێنەران پیشانداوە.

محەمەد شاکەلی

گەرمیان/ ٢٠٠٧

## سەرەتا

لەوساوە خۆم ناسیوەتەوە ((هەرای برایم خان)) و رۆژی (هەیەجانەکە)م* هاتووەتە بەر گوێ و لەو کەسانەی کە خۆیان لەو هەرا و هەیەجانە بەشداریان کردووە و تیادا بوون چەندەها نموونە لەو روداوەیانم لەدەم بیستووە، کە کەوتمە پێ و شوێنی ئەو روداوانە چوومە ناو جەرگەی دێهاتی ئەو مەڵبەندەی کە (هەرا)یان (شۆڕشەکەی) تیادا تەقیوەتەوە، ئینجا کەوتمە سەر ئەوەی لەو سەرچاوە زیندووانەوە رووداو و کارەسات تۆمار بکەم تاوەکو لە رۆژانی داهاتوودا بەچاپیان بگەیەنم، ئەوەبوو ئەو هیوایەم لەسەر بەرگی کتێبی (کتێبخانەی کوردی ساڵی ١٩٦٠)مدا دەربڕی ساڵێکی بەسەردا تێنەپەڕی زەبر و زەنگ دەستی پێکرد و لە مەڵبەند دوور خراینەوە و هەر سەرچاوەیەکیشم تۆمار کردبوو بەچاو تروکاندنێك لەناو چوون.

پاش بڵاوبوونەوەی بەیانی یانزدەی ئاداری ساڵی ١٩٧٠ دیسانەوە چوومەوە ناو گوند و دێهاتەکانی ناوچەی ئەو شۆڕشە بینیم هەندێ لەو کەسانەی لە چلەکان و پەنجاکاندا سوودم لێوەرگرتبوون کۆچی دواییان کردووە، بەڵام هێشتا چەند ژمارەیەك لە شۆڕشگێڕانی ئەو حەلە لەژیاندا بوون شتێکم لێ وەرگرتن‌و خستمە سەر ئەوەی لەبیرم مابوون ئینجا کەوتمە خوێندنی ئەو سەرچاوانەی دەربارەی ئەو بزووتنەوەیە شتێکیان بڵاوکردۆتەوە هەموو ئەو کەرەستانەم

---

* رۆژی (هەیەجانەکە) واتە رۆژی هەڵچوون دژی داگیرکەر، لەناو بەشێك لە دانیشتووانی کفری‌و دەوروپشتیدا شۆڕشی برایم خانی دەلۆ بە رۆژی (هەیەجانەکە) یان بە (هەرای برایم خان) ناو ئەبرێت.

تۆمار کرد، کەوتمە گەلاڵە کردنیان، لەسەرەتای هەشتاکاندا بەعەرەبی نووسیمەوە و بەهیوای ئەوەی بەچاپی بگەیەنم، بەلام (ئەوەی لای بەنە خەیاڵە لای خوا بەتاڵە) ئـــەو هیوایەم بەکۆرپەیی لەبارچـوو، نـەخێر

ئەمجارە دەستێکی ترم پیاهێنایەوە و سەر لەنوێ بەکوردی دامڕشتەوە بۆ ئەوەی جارێك با کورد لە مێژووی نزیکی خۆی بگات، بۆئەوەی برای عەرەبیشمان لە خەباتی نزیکی هاوبەشمان بگات بەعەرەبی کردنی ئەرکێکی ئەوتۆ گران نییە.

ئەم کتێبە بریتیە لە پێنج بەش، بەشی یەکەمیان لێکۆڵینەوەی ئەو سەرچاوانە ئەکات کە لەسەر شۆڕشی برایم خان شتێکیان بلاوکردۆتەوە، بەشی دووەمیان لەو زەمینەیە ئەدوێ کە شۆڕشەکەی تیادا تەقیوەتەوە و ئەرکی شۆڕشی کەوتۆتە سەر واتە مێژووی شاری (کفری) لە دێر زەمانەوە تا ساڵی بیست، لە بەشی سێهەمدا لە مێژووی ئەو هۆزە شۆڕشگێڕە دواوم کە شۆڕشی بەرپاکردووە و قورسایی ئەو رووداوەی کەوتۆتە سەر لەتەك ئەوەدا کورتە مێژوویەکی ئەو هۆزانەم دەربڕیوە کە ناویان لەو راپەڕینەدا هاتووە، بەشی چوارەم بۆ رووداوەکانی شۆڕشی برایم خان تەرخان کراوە زۆربەی ئەم بەشەم لە زاری ئەو شۆڕشگێڕانە وەرگرتووە کە لەو ڕاپەڕینەدا بەشداریان کردووە، لە بەشی پێنجەمدا هاتوومەتە سەر دەربڕینی کارکردنی ئەو رووداوە مێژووییەی بەسەر شاری کفری و ئەو شۆڕشگێڕانەدا و بەهەلم زانیوە ناوی ئەو کاربەدەستانە تۆمار بکەم کە لە دامەزراندنی دەوڵەتی عیراقەوە تا ئەم نزیکانە (قایمقام و سەرۆکی شارەوانی و بەڕێوەبەری قوتابخانە) بوون تاوەکو ببێتە تۆمارگەیەك بۆ لێکۆڵینەوە و لەسەر نووسینی لەمەوپاش.

ئەم کتێبە بەپێی توانا لە بنج و بناوان و رەگ و ریشەی ئەو شۆڕشەوە تێهەڵچووە تا گەیشتووەتە خودی شۆڕشەکە و سەرکەوتووەتە سەر لق و

پۆپەکەشی، هەروەها بەشێوەیەکی قووڵ و فراوان لە پەیوەندیەکانی ئاسۆیی و ستونی ئەو شۆڕشە دواوە لەگەڵ شۆڕشەکانی پێش خۆی و سەردەمی خۆی، بەم کتێبە توانیم ئەرکێکی سەرشانم دەربارەی ئەو فەرماندە تێکۆشەرە کە (برایم خانە) و ئەو هۆزە شۆڕشگێڕە کە (دەلۆ)یە و ئەو شارە قارەمانە کە (کفری)یە پێشکەش بەنەوەی ئەمرۆمانی بکەم، هیوادارم مایەی رەزامەندیتان بووبێت.

**مصطفى نەریمان**

**بەغداد – ساڵی ١٩٨٤**

**بەشی یەکەم**

**کورتەیەك دەربارەی رووداوەکانی شۆڕشی بیست:**

مێجەر (دیلی) کە حاکمی سیاسی بەریتانیا ئەبێت لە شاری (دیوانیە)دا خەرج و باجێکی قورسی خستبووە سەر خەڵکی رەش و رووت، هەروەها بێگاری پێ ئەکردن لە کردنەوە و تەخت کردنی رێگاوبان و پاککردنەوەی جۆگە و ئاو و ئاوبەست دروست کردن و ئەو کەسانەی کە (مەزبەتە)[1]کانیان مۆر کردبوو تەنگیان پێهەڵچنین، حاکمی گشتی دیوانیە داوای لە جێگرەکەی خۆی کرد لە (رمیثە)[2] کە گەورەی هۆزی (بەنی جەحیم – ظەواڵم) بانگ بکاتە لای خۆی و رەوانەی لای ئەوی بکات، جێگری حاکمیش رۆژی ٢٩ی حوزەیران (شێخ شەعلان ئەبولجون)ی بانگ کردە لای خۆی بە رووی گرژی و مۆنییەوە پێشوازی لێکرد و فەرمانی مێجەر (دیلی) پێراگەیاند و دەرگای لەسەر داخست بەو هیوایەی سبەینێ رەوانەی بکات، شەعلانیش بەیەکێك لە پیاوەکانی ووت ((ئەمرۆ وا من بەند کراوم سبەینێش رەوانە ئەکرێم، برۆ بەکەس و کارم بڵێ دە لیرەم بە کتوپڕی بۆ رەوانە بکەن)) کەس و کارەکەی لە قسەکەی گەیشتن کتوپڕ لە سپێدەی رۆژی (٣٠ی حوزەیرانی ١٩٢٠)دا ئەو دە چەکدارە هەڵیان کوتایە سەر مەرکەزی پۆلیس ئەوانیش بەرەنگاریان لێ کردن و دوو پۆلیسیان لێ کوژرا و ئەمانیش بەزۆری کوتەك شێخ شەعلانیان لە بەندیخانە دەرهێنا و بەهۆسە[3] کێشانەوە گەڕانەوە ناو هۆزەکەیان.

رۆژی رزگار کردنی شێخ (شەعلان) لە بەندیخانە واتە رۆژی (٣٠)ی حوزەیران بەرۆژی سەرەتای شۆڕشی ساڵی بیست ئەدرێتە قەڵەم، لەو رۆژە بەولاوە شۆڕشگێڕان ریزی خۆیان رێکخست و پەیوەندی ناو خۆیان قایم کرد و دەستیان کردە هەڵوەشاندنەوەی خەتی شەمەندەفەر و تێکدانی پرد و پەلاماردانی سەربازخانەکانی بەریتانی، حکومەتی بەریتانی کتوپڕ سوپایەکی (٥٣٠) سەربازی بەرەو (رمیثە) خستەڕێ، پێش ئەوەی بکەوێتە پەلاماردانی شۆڕشگێڕان لە

چواری تەممووزدا هێرشیان بردنە سەر و ئابلۆقەیان دان و (٤٣) کەسیان لێ کوشتن، حکومەتی داگیرکەر بۆ فریاخستنی ئابلۆقەدراوان هێزێکی دیکەیان نارد لە نزیك شاری (رمیثە) شۆڕشگێڕان لەم هێزەش راپەڕین و (٤٧) کەسیان لێ کوشتن و (١٦٧) کەسیشیان لێ بریندار کردن و ناچار بوون پاشەکشێ بکەن، تا ٢٢ی تەممووز چەند هێزێکی تریان نارده سەر شۆڕشگێڕان لە مایەپووچی بەولاوە هیچ سەرکەوتنێکیان وەدی نەهێنا.

ئەمە لووتی بەریتانیای شکاند و شۆڕشیش لە قاوغەکەی خۆی دەرچوو تەنیەوە هۆزی (فەتلە)یش بەسەرۆکایەتی (مزهر فرعۆن) قەزای (ئەبو صخیر)یان لەدەست سوپای بەریتانی رزگار کرد ئەوەندەی پێنەچوو قەزاکانی (شامیە) و (سەماوە) و شاری (دیوانیە) خۆیشی رزگار کرا، شۆڕش رۆژ بەرۆژ بەرفراوانتر ئەبوو کاربەدەستانی بەریتانیا لە خۆیانەوە شارەکانی (کەربەلا و نەجەف و کوفە)یان بەجێهێشت، لە بیستی تەممووزدا شۆڕشگێڕان بە سەرۆکایەتی (عبدالواحد حاجی سوکەر) و (سەید عەلوان یاسری) ناوچەکەی (کفل)یان رزگار کرد، لەم ئارایەدا چەند شەڕێکی قورس بەرپابوو گەورەتریان شەڕەکەی (رۆستەمیە) بوو کە بە (رارنجییە) ناوبانگی دەرکرد، سوپای بەریتانیا بەزەرەر و زیانێکی گەورەوە شەڕەکەیان دۆڕاند و شۆڕشگێڕان تیادا سەرکەوتن و چەك و ئازوقەیەکی باشیان تیا بە دەسکەوت.

شۆڕش هەر لەناوچەی فوراتی ناوەڕاستدا نەمایەوە بەڵکو لیوای (رەمادی)یشی گرتەوە، لە بەرەبەیانی رۆژی ١٢ی ئابی ١٩٢٠دا (شێخ ضاری الزوبعي) و (خەمیس و سەلمان)ی کوڕی و چەند چەکدارێکیان بەپێی داواکردنی (لچمان) لە (خان النقطة)[٤] چاویان پێکەوت، (لچمان) بە شێخ ضاری گەیاند چۆن لەم رۆژانەدا حکومەتی بەریتانیا لە بەغداد ئاژاوە گێڕەکانیان[٥] گرتووە و دوور خستۆتەوە نەخێر پێی لێ بەرزکردەوە و دەستی کردە هەڕەشەکردن و قسەی ناڕەوا ئاراستە کردن بەشێخ، کوڕەکانی شێخ ئەمەیان بۆ قووت نەدرا دەماریان بزوت و دەمانچەیان لە لچمان هەڵکێشا گەوزاندیانە ناو خوێنی خۆیدا و هۆزەکانی ئەو دەورو پشتەش راپەڕین و هێرشیان بردە سەر سەربازگەکانی

ـەریتانی، لە سێی ئەیلولی ١٩٢٠دا هێزێك لە بەغداوە بە سەرۆکایەتی جەنەراڵ (هاڵدین) چووە سەر شۆڕشگێڕانی (رەمادی) و لە ڕێگا شۆڕشگێڕانیان لێ راپەڕی، هێزدکە چووە پێشەوە تا گەیشتە قەڵاکەی (ضاری) و لە ٢١ی ئەیلولدا دایانە بەرتۆپ و وێرانیان کرد و لە ٢٤ی ئەیلولدا شاری فەلوجەیان گرتەوە.

لە ١٢ای ئابیشدا هۆزی (کەرخە) شاری (بەعقوبە)یان لە داگیرکەر رزگار کرد و بەسەرۆکایەتی (محمود موتوەلی) ئەنجومەنێکیان بۆ بەڕێوەبردنی شار پێکهێنا ئەوی شیاوی باسکردن بێت کوردێکی نەبەرد کە ناوی (ئیبراهیم عەبرەگە)* بوو لەم ناوە دەورێکی باشی لە شۆڕشدا گێڕا، هەر لەو رۆژانەشدا هۆزی (عەززە) بەسەرۆکایەتی (حەبیب خەیزەران) شاری (دەڵتاوە — خالص)یان رزگار کرد و کاپتن (لوید)ی جێگری حاکمیان بەدیل گرت، لە ١٤ای ئابیشدا هۆزی (تەمیم) شاری (مقدادیە — شارەبان)یان رزگار کرد.

لە ١٣ای ئابی ١٩٢٠دا هێزێکی بەریتانیا لە هندستانەوە گەیشتە بەغداد پاش ئەوە بەچەند رۆژێك هێزێکی تریشیان گەیشتێ، لە پێشدا هێزێکیان ناردە سەر لیوای دیالە تا رێگەی ئێرانیان بۆ پاك بێتەوە لە ٢٧ی ئابدا شارەبانیان گرتەوە لە ٨ی ئەیلولدا شاری (خالص)یان گرتەوە، هێزی بەریتانی هەر شارێکی ئەگرتەوە دەستی ئەکردە تالان کردن و ئاگر تێبەردان و گرتنی ئەم و ئەو و گوللەباران کردنیان[٦]، پاش ئەوەی ئەم شارانەیان داگیر کردەوە جەنەراڵ (هاڵدین) بەیاننامەیەکی بۆ هۆزەکانی دیالە بڵاوکردەوە و تیادا داوایان لێ ئەکا کە بەرەنگاری ئەو سوپایە نەکەن کە بەرەو ژوور ئەڕوا بۆ ئەوەی شۆڕشەکانی (قورەتو و کنگربان) دابمرکێنێت، مەبەستیشی شۆڕشی برایم خان بوو لە کفری و شۆڕشەکەی خانەقی بوو.

---

* بڕوانە —سلێمان فیضی- (في غمرة النضال) (لاپەڕە: ٢٨٥ — ٢٨٦).

**ئەو سەرچاوانەی دەربارەی شۆڕشی برایم خانیان نووسیوەتەوە:**

١- كتێبی (الثورة العراقية الكبرى) نووسینی (عبدالرزاق الحسنی) چاپی بەیروت ١٩٥٢ ژمارەی لاپەڕەكانی (٢٦٨) لاپەڕە:

بەناونیشانی (بەرەی كفری – واتە، بەرەی شەڕی كفری) لە لاپەڕە ١٧٠ی (ب)ی كتێبەكەیدا ئەمەی نووسیوە: (دانیشتوانی كفری ناڕەزایی خۆیان دەربارەی رەوشتی كاپتن –سلمۆن-ی حاكمی سیاسی لە كفری دەربڕی، چونكە قسەی خراپی پێ ئەوتن، بێ پێویست باج و خەراجی خستبووە سەر ئەو خەڵكە و فەرمانبەرێكی هیندیش لەو شارەدا بوو كە رەوشتی لەگەڵ خەڵكەكە زۆر توند و تیژ و ناڕەوابوو. لە ئابی ١٩٢٠دا (سلێمان فەتاح) كە لاوێكی نیشتمانپەروەر بوو بەكفریدا تێپەڕی و رەوشتی خراپی ئەم دوو فەرمانبەرەیان بۆ گێڕایەوە، ئەویش پەیوەندی لەگەڵ گەورەكانی ناو شاردا كرد و دەنگوباسی شۆڕشی فوراتی بۆ گێڕانەوە و پێی ووتن كە دەسەڵاتی بەریتانی لە عیراقدا بەرەو لێژی ئەڕوات و بۆی دەرخستن ئەبێ ئەمانیش دژی بەریتانیا رابپەڕن لەبەر ئەمە (برایم خان)ی سەرۆكی هۆزەكانی دەلۆ لەگەڵ چەند تیرەیەكی جافدا رێككەوت و چوونە سەر لوتكەی شاخی (باوە شاسوار) كە ئەڕوانێتە سەر كفری و دەست رێژیان كردە سەر شار و سەرای حكومەت، سەلەمۆن لەمە راچڵەكی و ویستی سەركەوێتە سەرێ و چاوی بە برایم خان بكەوێ، بەڵام (سەعید وەنداوی)[٧] ئامۆژگاری كرد خۆی نەخاتە ئەو مەترسیەوە، چونكە ئێستا ئەو هۆزە لە حاڵەتی هەیەجاندا بەڵام سەلەمۆن گوێی نەدایە ئامۆژگارییەكانی و وەهای پیشاندا كە لەگەڵ برایم خاندا پەیوەندی باشە و ئەبێت خۆی بچێت و پەیوەندی لەگەڵ بكات تاوەكو لەم رێگایە لای بدات، هەر كە سەلەمۆن سەركەوتە سەرێ شۆڕشگێڕان لای خۆیان تەوقیفیان كرد و هێرشیان برد و سەراكەیان گرت و هێزی (شەبانە)یان چەك كرد و بەیداخی بەریتانیایان هێنایە خوارەوە و هەر ئازوقە و چەك وماڵێكیان لە بودجەی حكومەتدا هەبوو بردیان، لەسەر ئەمە حكومەتی بەغداد بەلاغێكی

دەرکرد و ئەم هەواڵە گەیشتە مێجەر (لۆنگریك)ی حاکمی سیاسی لە کەرکوك ئەویش تاقمێك لە تاڵەبانیەکانی بەسەرۆکایەتی (شێخ حەمید) و تاقمێکیش لە زەنگەنە بە سەرۆکایەتی (عبدالکریم) و (موراد رحمه الله)ی[٨] سەرۆکی شەبانە بەهێزێکەوە کەوتنەڕێ بەرەو (کنگربان) کە ٣٠ کیلۆمەترە لە کفریەوە دوورە سوپاکەیان پڕ چەك بە تۆپ و رەشاشەوە کە گەیشتنە کنگربان لەوێ (موراد بەگ) کاغەزێکی بۆ سەعید وەنداوی نووسی داوای لێکرد بکەوێتە نێوان حکومەت و شۆڕشگێڕانەوە، ئەویش لەبەر مەترسی هەڵوێستەکە ئەوەی نەگرتە ئەستۆ، هێزەکە بەرەو کفری کەوتەڕێ و شەڕ کەوتە نێوان ئەمان و شۆڕشگێڕانەوە، لەو شەڕەدا کوڕی کوێخا ئەوڕەحمانی کارێزی و چەند کەسێك کوژران و بەرامبەر ئەو ژمارەیەش لە سوپا کوژرا کوشتنی کوڕی کوێخا کاری کردە سەر شۆڕشگێڕان و لە بریتی خوێنی ئەودا (سەلەمۆن)یان کوشت.

لۆنگریك لە کفری لە سەرای میریدا لەگەڵ (بەهجەت بابان و جەمیل بابان و سەعید وەنداوی و محسن ئاغا و عومەر ئاغا) کۆبوونەوەیەکی کرد و داوای لێکردن تەرمی سەلەمۆن بدۆزنەوە، کە دۆزیانەوە بینیان دەستێکی بڕاوە، لەسەر ئەنجامدا باجێکی دە هەزار روپیەیان خستە سەر دانیشتوانی کفری لەگەڵ ٥٠٠ تفەنگ، دانیشتوانی شار ناچار بژاردیان، شێخ حەمید تاڵەبانی کرا بەقائمقامی کفری و لۆنگریك بەخۆی و هێزەکەیەوە گەڕایەوە کەرکوك)).

## لێکۆڵینەوە:

١- مامۆستا (عبدالرزاق الحسنی) لە دەست نیشان کردنی دۆست و دوژمنانی شۆڕش بەهەڵەدا نەچووە هەروەها باشی بۆچووە کە دانیشتوانی شار لە رەوشتی سەلەمۆن و دەست و دایەرەکەی نارەزاییەکی زۆریان هەبوو.

٢- (سلێمان فەتاح) لە هۆزی (بەیات)ی ناوچەی دووزە کوڕی (فەتاح پاشا)یە کە یەکەم کارگەی چنینی کاڵای هێنایە عیراقەوە، سلێمان هیچ پەیوەندی بەکفریەوە نەبووە و کەسێکی لە شۆڕشگێڕان نەناسیووە و لە کەسم نەبیستووە بڵێن لەو سەردەمەدا هاتووەتە کفری.

٣- بۆ ئەوەی شۆڕشگێڕان بەدناو بکەن دەست و دایەرەی سەر بەبەریتانیا ئەو دەنگ و باسەیان بڵاوکردەوە گوایە شۆڕشگێڕان دەستی سەلەمۆنیان بڕیوە، ئەمە لە ڕاستیەوە زۆر دوورە، برایم خان خۆی ئاگای لە کوشتنی سەلەمۆن نەبووە و کوشتنی ئەم دیلەی زۆر لا گران بووە ئیتر چۆن پاش کوشتن دێن دەستی ئەبڕن؟

٤- (کنگربان) بە موڵکایەتی هی جەمیل بەگی مەجید پاشای بابانە، دانیشتوانی گوندەکە لەهۆزی (دەلۆ)ن و زۆربەیان لە تیرەی (تەرکەوەند)ن، ئەم گوندە بە دە کیلۆ مەترەیەك ئەکەوێتە رۆژئاوای کفریەوە نەك بە ٣٠ کیلۆمەترە، ئێستگەی شەمەندەفەر بەدوو کیلۆمەترەیەك نزیك کنگربان بوو، هەروەها سەربازگەیەکی بەریتانی بەنزیکەوە بوو لە ئێستگەکەوە نزیك تر بوو لەوەی لە کنگربانەوە.

٢- یادداشتەکانی رەفیق حیلمی (١٨٩٨ — ١٩٦٠):

مامۆستا رەفیق حیلمی لە نێوان ساڵانی (١٩٥٦ — ١٩٥٩) شەش بەرگە یادداشتی[٩] خۆی بەکوردی لەچاپدا و بڵاوکردەوە، لە بەرگی دووەمی یادداشتەکەیدا دەنگ و باسی ئەو کۆبوونەوانەی گێڕاوەتەوە کە لە بەغداد لە ماڵی (حەمدی بەگی بابان) و لە (مزگەوتی حەیدەر خانەدا) دەکرا و مامۆستا رەفیق حیلمی لەو رۆشنبیرانە بوو کە لە شێخ مەحمودی حەفیدەوە زۆر نزیك بوو و

جێی متمانەی شێخ بوو، خوالێخۆشبوو لە یادداشتەکەیدا دەربارەی شۆڕشی برایم خان لەم چەند دێرە بەولاوە هیچی نەنووسیوە کە ئەڵێت (... شۆڕش هەڵگیرسا، هەموو فوراتی گرتەوە، ئەم جارەیش کورد راپەڕی و برایم خانی دەلۆ لە هەرێمی کفری شۆڕشێکی بەرپا کرد و کفری گرت و حاکمی سیاسی سالۆمین لەم شەڕەدا کوژرا) لە شوێنێکی تری هەمان بەرگدا ئەڵێت (پێش ئەوەی حەمدی بەگی بابان لە تاقیکردنەوە بکەوێت و لە حیساباتی ئینگلیز بخرێتە دەرەوە ویستم بگەرێمەوە سلێمانی، چونکە شۆڕشی کوردەکانی دەورو پشتی کفری و حەرەکەتی برایم خان تەواو بووبوو رێگەی نێوان بەغدا و کەرکوک کرابووەوە).

## لێکۆڵینەوە:

لە هاوینی ساڵی ١٩٤٤دا کۆمەڵی هیوا (١٩٣٩ — ١٩٤٥) لە ئاوایی (کەلار)[١٠] کۆبوونەوەیەکی تایبەتی پێکهێنا تاوەکو گیروگرفتی ناوخۆ ئاسان بکرێ، شەوێ کە ئەو کۆبوونەوەیە تەواو بوو لە گەڕانەوەدا لەگەڵ رەفیق حیلمیدا بە ئۆتۆمبێلەکەی کاک (فلامەرز) و لەگەڵ کاک (حمە صالحی دەلۆ)یی بەرەو ئێستگەی شەمەندەفەری کفری چووین، کە ئۆتۆمبێلەکە گەیشتە کەناری دێی (برایم خان) مامۆستا داوای لێکردین کە (عەزیزی برایم خانی) چاو پێ بکەوێ، کە عەزیزی بینی پێی ووت (رۆڵە، باوکی تۆ پاڵەوانێك بوو بۆ خۆی و لای شێخ مەحمود پایە و مەقامی خۆی هەبوو ئەبێ تۆش لەسەر رێگەی باوکت بڕۆیت).

لەو ساڵانەی کە مامۆستای خوالێخۆشبوو یادداشتەکانی چاپ کرد و بەشی ئەو شۆڕشەی ئەوەندە تیادا نەبوو چووم و گلەییم لێکرد و بەڵێنیدا کە چارەسەری ئەو کەلێنە بکات، ئەوەبوو مەرگ ماوەی ئەوەی نەدا کە ئەوەی لە خەیاڵیدابوو بیخاتە سەر کاغەز.

٣- چیم دی؟

مامۆستا (ئەحمەد خواجە، ١٩٠٢) لە حەفتاکاندا سێ بەرگە یادداشتی خۆی دەربارەی بزووتنەوەکانی کوردی سالانی ١٩١٩ – ١٩٢٠ بلاوکردەوە و دەوری خۆی چی بووە و چی بەچاو بینیوە تیادا تۆماری کردووە، لە بەشی سێیەمی یادداشتەکەیدا دەربارەی شۆڕشی برایم خان نووسیویەتی ئەڵێت ((لە کفری لەلایەن برایم خان و هاوڕێکانیەوە وەك وەیسی بەگ و حەمید عبدالرحمن کارێزی شۆڕشێك بەرپا بوو لە تشرینی ١٩٢٠ – ١٩٢١ بەیەك دەست هێرشیان بردە سەر کفری پاش شەڕێکی قورس و کوشتنی چەند کەسێك لە دوژمنان کە یەکێکیان حاکمی سیاسی بوو کفریان گرت و سی و سێ ڕۆژ حوکمڕانیان تیادا کرد، بەریتانیەکان بۆیان دەرکەوت لە توانایاندا نییە بەتەنها خۆیان ئەم بزووتنەوەیە بکوژێننەوە پەیوەندیان بە شێخ محمد عەلی تاڵەبانی و میلەری حاکم سیاسی کەرکوکەوە کرد، سوپایەکی گەورەی چەکدار بەتۆپ و چەکی نوێ گەیشتە کفری و شەڕ لەنێوان هەردوولا روویدا، ناچار برایم خان کشایەوە و دەستی دایە شەڕی چەتەگەری، لەدواییدا دوژمن ناچار بوو بڕیاری لێخۆشبوون بۆ شۆڕشگێڕان دەربکات، هەرچەندە هیوای هۆزی دەلۆ نەهاتە دی، بەڵام مێژوو ناوی ئەو شەهیدانە تۆمار ئەکات کە خۆیان لە پێناوی نیشتماندا بە قوربانیدا وەك شەهید حەمید عبدالرحمن، سوپاس بۆ کاك صالح دەلۆیی کە[11] دەنگ و باسی ئەو شۆڕشەی بۆ گێڕامەوە.

**لێکۆڵینەوە:**

١- ئەمە یەکەم سەرچاوەیە کە بەڕاستی ئەوەی دەربڕیوە برایم خان پاش کشانەوەی لە کفری و چەکی فڕێ نەداوە و شەڕی چەتەگەری کردووە.

٢- لەدەست نیشان کردنی مێژووی رزگار کردنی شار و ناوهێنانی هەندێ کەسەوە کەوتووەتە هەڵەوە.

٣- نووسینەکە لە بیستنەوە نزیکترە لەوەی بەچاوی خۆی دیبێت.

٤- كتێبی (ابراهیم خان ثائر من کردستان):

دکتۆر (موکەڕەم تاڵەبانی) لە ساڵی ١٩٧٠دا لە کتێبێکی (١٠٤) لاپەڕەیدا باسی شۆڕشی برایم خانی کردووە و تیشکی خستوەتە سەر شاری کفری و ستراتیجیەت و گرنگێتی ئەو شارەی دەربڕیوە هەروەها دەوری سەرۆکایەتی برایم خانی دەربڕیووە و لە نەبەردی و ئازایەتی ئەو خەڵکە دواوە دژی پیلانی دوژمنان و بەوردی دەست نیشانی دوژمنانی شۆڕشی کردووە کە شێخ حەمیدی تاڵەبانی بە پێشڕەوی ئەو بەرەیە داوەتە قەڵەم.

## لێکۆڵینەوە:

١- بەیەکەم کتێب ئەژمێردرێت کە بۆ شۆڕشی برایم خان تەرخان کرابێت.

٢- بەسەرکەوتووانە وەسفی ئەو کەسانەی کردووە کە ناوی هێناون، جا ئەو کەسانە لە ناوجەرگەی شۆڕشگێڕاندا بن یان لە بەرەی دژی شۆڕشدا بووبن.

٣- لەوەدا کەوتووەتە هەڵەوە کە برایم خانی بردوەتە سەر هۆزی (وەرمزیار)[١٢]، دانیشتوانی کفری و دەوروپشتی شار و ئەو سەرچاوانەی لەسەر برایم خانیان نووسیوە گومانیان لە (دەلۆ) بوونی برایم خان نییە.

٤- لەوەشدا دکتۆر کەوتووەتە هەڵەوە کە تشرینی یەکەمی بەمانگی ڕووداوەکە داناوە، لە ڕاستیدا مانگی ئابی ١٩٢٠ ئەگرێتەوە.

٥- لەو سەردەمەدا گوندی (زەرداو) بەدەست (عبدالکریم وادی ئاغای زەنگەنە)وە بووە، عبدالکریم ئاغاش هاوپەیمانی شێخ وەهاب و بەریتانیەکان بووە و کۆبوونەوەی دژ بە شۆڕش لەو گوندەدا ئەکرا لەبەرئەوەی هیچ نە جوتیارانی ئەو گوندە نەیان وێراوە بەشداری لە هەڵکەندنی هێڵی شەمەندەفەر بکەن چ جا پەلاماردانی شەمەندەفەری بەریتانی خۆی.

٦- هەموو سەرچاوەکان ئەوەیان دەربڕیووە کە هۆزی داودە بەسەرۆکایەتی (ڕەفعەتی سمایل بەگ)و بەهاوکاری کردن لەگەڵ بەیات لە مانگی ئابی ١٩٢٠دا

شاری دوزیان لە داگیرکەری بەریتانی رزگار کردووە، بەڵام مامۆستا موکەڕەم لەمەیشدا کەوتووەتە هەڵەوە کە دەڵێت (هۆزی داودە لە ترسی شێخ حەمید نەچوونە ناو ریزەکانی شۆڕشەوە).

٥- کتێبی (لمحات اجتماعیة من تأریخ العراق الحدیث)، بەرگی پێنجەمساڵی ١٩٧٨، نووسینی (د. عەلی وەردی):

لە لاپەڕەکانی (٦٠ – ٦١)ی کتێبەکەیدا دکتۆر (عەلی وەردی) بەناونیشانی (شۆڕش لە کفریدا) نووسیویە ئەڵێت: ((لە هەرێمی کفری برایم خان کە سەرۆکی تیرەکەیە لە تیرەکانی دەلۆ شۆڕشی بەرپاکرد و تیرەیەك لە هۆزی جاف یارمەتیاندا، ئەڵێن سلێمان فەتاح لە جوڵانەوەی ئەم هەرێمەدا دەستێکی هەبووە، لە بەغداوە لە ناوەڕاستی مانگی ئابدا گەیشتوەتە ئەم شارە و هانی سەرۆکەکانی شاری داوە و بۆی گێڕاونەتەوە کە شۆڕش لە فوراتی ناوەڕاستدا سەرکەوتووە. لە ٢٢ی ئابدا برایم خان و هاوڕێکانی سەرکەوتنە سەر شاخی (بابا شاهسوار) کە ئەڕوانێتە سەر کفری و لەوێوە دەستڕێژیان لە سەرای حکومەت کردوە ئەمەیش ئیشارەت بوو بۆ دەست پێکردنی شۆڕش، لەو کاتە مەعاونی حاکمی سیاسی (کاپتن سەلەمۆن) و هاوسەری لە کفریدا بوون و چەند کەسێك لەدانیشتووانی شار ئامۆژگاریان کرد کە خۆیان دەرباز بکەن، سەلەمۆن بەمە قایل نەبوو، (ویلسن) لە یادداشتەکەیدا ئەڵێت: سەلەمۆن لەو بیروباوەڕەدا بوو ئەگەر لەو هەل و مەرجە لە کفریدا بمێنێتەوە کارێکی مەعنەوی ئەکاتە سەر دانیشتوانی کفری، ئەو هەستی بەو ئەرکە کردبوو کە کەوتبووە سەری ئەبێ تا دوا کات شار بەجێنەهێڵێت، ئەم هەستەی لەجێی خۆیدا بوو (سالمون) بڕیاریدا خۆی بچێتە لای برایم خان و گفتوگۆی لەگەڵ بکات، چونکە وای دەزانی لەڕووی رەفاقەتەوە برایم خان ئامۆژگاریەکەی قبووڵ ئەکات و دەست لە شۆڕش هەڵئەگرێت، بەڵام هەر کە گەیشتە لای شۆڕشگێڕان گرتیان و هێرشیان بردە سەر شار و سەرایان

گرت و چی تیادا بوو تالآنیان کرد و ئالآی بەریتانیایان هێنایە خوارەوە، هاوسەری سەنەمۆن لە کفریدا مابووەوە چەند کەسێك گەیاندیانە سەربازگەی بەریتانیای ...زیك (کنگربان) لەوێ هێزێکی بەریتانی هەبوو بریتی بوو لە دوو فەسیلی ...یندی و هەندێ تۆپ و رەشاشیان هەبوو. هەر کە دەنگ و باسی شۆڕشی کفری گەیشتە مێجەر (لۆنگریك)ی حاکمی سیاسی کەرکوك هێزێکی پێکهێنا لە شەبانە و چەند کەسێك لە تالەبانی و زەنگەنە لەوێوە هاتنە ئێستگەی کنگربان و ئەو هێزە لە سەربازگەکەی کنگرباندا بوو تێکەڵیان بوو روویان کردە کفری و شەڕێك لە نێوان ئەوان و شۆڕشگێڕان بەرپا بوو چەندکەسێك لە هەردوولا کوژران، پەنجەی قەزا و قەدەر کوڕی (کوێخا ئەورەحمان کارێزی) کوشت کە یەکێك بوو لە سەرۆکەکانی شۆڕش، شۆڕشگێڕانیش کتوپڕ (سالمۆن)یان کوشت کە بەدیل گیرابوو دەستێکیشیان بڕی، کوشتنەکەی لە تۆڵەی کوشتنی کوڕی کارێزیدا بوو، شەڕەکە بەسەرکەوتنی (لۆنگریك) دوایی هات، دە هەزار روپیە و پێنج سەد تفەنگ سزا خرایە سەر دانیشتوانی (کفری)، حەمید تالەبانی کرایە قایمقام، ئەوانیش گەڕانەوە کەرکوك.

**لێکۆڵینەوە:**

١- دکتۆر عەلی وەردی لەسەر چاوەکانی پێشوتر مێژووی رزگار کردنی کفری دەست نیشان کردووە و ئەوەی دەربڕیوە کە هێزی دوژمن لە ئێستگەی کنگرباندا بووە نەك لە گوندی کنگربان خۆی.

٢- لەوەدا بەهەڵە چووە کە دەورێکی داوە بە (سلێمان فەتاح) دیارە ئەم خاڵەی لە مامۆستا حوسنیەوە وەرگرتووە.

٣- دکتۆر وەردی نەیتوانیوە ئەم مەوزوعە بەتەواوەتی تێر بکات، بۆیە وتویەتی: لێکۆڵینەوەی ئەم رووداوانەی کوردستان ئەخەمە ئەستۆی برا کوردەکانم، خۆیان.

٦- کتێبی (دور الشعب الکوردی في ثورة العشرين العراقية) نووسینی د. کمال مەزهەر ئەحمەد، چاپی ١٩٧٨، ١٩٦ لاپەڕەیە:

پێش ئەوەی دکتۆر کەمال ئەم کتێبەی لە چاپ بدات چەند جارێك لە لاپەڕەی ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا دەربارەی ڕۆڵی کورد لە شۆڕشی بیستدا بەدوور و درێژی نووسیویەتی، ئەم کتێبەشی لەلایەن هەندێ لە نووسەرانەوە پەسەند کراوە و شتی لەسەر نووسراوە[١٣]. بەشی دووەمی کتێبەکەی دکتۆر کەمال تەرخان کراوە بۆ ڕۆڵی کورد لە شۆڕشی بیستدا، لەم بەشەدا نۆ لاپەڕەی بۆ (شۆڕشی برایم خان) تەرخان کردووە، بەپێی ئەو زانیاریانەی لەبەر دەستیدا بووە باسەکەی تێر و تەسەل کردووە لە زۆر لایەنەوە سەرکەوتووە.

## لێکۆڵینەوە:

١- بەسەرکەوتووانە ڕووداوەکانی شۆڕشی گێڕاوەتەوە.
٢- چووەتە قوڵایی ڕەگی شۆڕشی بیستەوە، ڕووداوەکانی پێش شۆڕشی هەموو شی کردۆتەوە و پێکەوە جەمسەری داون.
٣- دکتۆر کەمال لەوەدا بەهەڵەدا چووە کە (برایم خان)ی بەلای وەرمزیارەوە ڕاکێشاوە لەمەدا پشتی بەیەك سەرچاوە بەستووە.
٤- زۆر ستایشی شۆڕشی کەمالیەکانی کردووە و یەکێك لە هۆی سەرنەکەوتنی شۆڕشی بیست ئەباتەوە سەر ئەوەی (کەلە سنوورێکی تەسکدا جولاونەتەوە و چاویان نەبڕیوەتە شۆڕشی مستەفا کەمال بزانن ئاخۆ چۆن ئەو لەگەڵ دەرەوەدا پەیوەندی پتەو کردووە). مستەفا کەمال لەگەڵ سۆڤیەتدا ڕێکەوتنێکی حەوت خاڵی مۆر کرد[١٤]، سۆڤیەت لەو ڕێکەوتنە بەهیوای ئەوە بوو کەمالیەکان ڕێیان بدەن بیروڕایان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بڵاو بکەنەوە بەرامبەر ئەمە سەربەخۆیی بدەنە موسڵمانەکانی سۆڤیەت، چ مادی و چ مەعنەوی مستەفا کەمال یارمەتی تەواوی وەرگرت و خۆی پێ بەهێز کرد و

دوژمنی وڵاتی پێ دەرکرد و هەر ئەو چەکەشی ئاراستەی سنگی کورد کرد، ناهەقی نەبووە (رەفیق حیلمی) لە یادداشتەکەیدا بڵێت (پێ بەوەدا ئەنێم من لەو دیفاعەی لە تورکم ئەکرد[١٥] بە هەڵەدا چوو بووم، چونکە نیمە مانان لە عیراقدا نەمان ئەزانی لەناو کوردە نیشتمان پەروەرەکان چی هەیە، ئەو نووسەرانەی کە مستەفا کەماڵیان بەگورگەبۆر ناوبردووە بەهەڵەدا نەچوون)، هەڵوێستی (نەهرۆ)ی سەرەك وەزیرانی هندستان لە ئاستی قووتدانی ماڧی کورد لەبیر ناچێت بۆیە کورد رۆڵەی خۆی بەنا (نەهرۆ) و (غاندی)یەوە ناو ئەنێت.

٧- ولاية الموصل: دراسة في تطوراتها السياسية ١٩٠٨ — ١٩٢٢:[١٦]

لە نامەکەدا دەربارەی (شۆڕشی کفری) زۆر بێ لایەنی دواوە و باسی هۆی شۆڕشەکەی کردووە و هەندێ لە رووداوەکانیشی گێڕاوەتەوە.

لەسەرچاوەکانی تری عیراقیدا وەك (الثورة العراقية الكبرى لعبدالله الفياض ١٩٧٢) و (الحقائق الناصعة في الثورة العراقية ١٩٥٢) لەیەك دوو دێر بەولاوە هیچی تر نەنووسراوە.

٨- سەرچاوەی بێگانەکان:

ئەو کاربەدەستە گەورانەی ئینگلیز کە لەو سەردەمەدا لە عیراقدا فەرمان رەواییان کردووە — -هەریەکە بەپێی بۆچوونیان- کەم تا زۆر دەربارەی ئەو رووداوانە نووسیویانەتەوە وەك (ئەدموندسن) و (سۆن) و (مسس بێل) ئەو یادداشتانە زۆریان کراونەتە عەرەبی، بەڵام یادداشتەکانی (ئەرنۆڵد ویلسن) کە جێگری حاکمی سیاسی گشتی عیراق بووە و (أ. ل. هۆڵدین) کە فەرماندەی گشتی سوپای بەریتانی بووە لە عیراقدا ئەهەمیەتێکی تایبەتی خۆیان هەبووە، هەردووکیان ئەنگوستیان بۆ شۆڕشی کفری درێژ کردووە و هەردوو کتێبەکەشیان

گراونەتە عەرەبی[١٧]. بەپێی پێویست لە ناو ئەم کتێبەدا پەنجە بۆ ئەو دوو سەرچاوانە رائەکێشن.

لەو کتێبانەی کە بێگانەکان دەربارەی شۆڕشی بیستیان نووسیبێت کتێبەکەی نووسەری سۆڤیەتی (ل. ن. کاتلۆف)[١٨]ە، کتێبەکە بریتیە لە چواربەش، نووسەر دەربارەی باری کۆمەلایەتی و ئابووری عیراق دواوە ئینجا چووەتە سەرباسی سیاسەتی ئینگلیز و رووداوەکانی شۆڕشی گێڕاوەتەوە و گرنگێتی ئەو شۆڕشەی دەربڕیوە، دەربارەی شۆڕشەکانی کفری و خانەقی بەیەك دوو دێڕ نەبێت ئاوڕێ نەداوەتەوە، لە شوێنێکیدا ئەڵێت (لە بیست و چواری مانگی ئاب شۆڕشگێڕەکان کفریان داگیر کردووە) و لە شوێنێکی تردا ئەڵێت (شۆڕشگێڕەکان چەند گوندێکیان لە هەرێمی رەواندز و کفری گرت) دەربارەی شۆڕشی خانەقینیش نووسیویە ئەڵێت (دەزگای موخابەراتی بەریتانی هۆزی کەلهوڕیان دژی شۆڕشگێڕانی دەلۆ لە هەرێمی خانەقی هاندا بەوەی کۆمەڵێك لە هۆزی کەلهوڕ بە سەرۆکایەتی گەورەکانیان پارێزگاریان لە دەزگاکانی کۆمپانیای نەوتی ئێرانی لە هەرێمی نەوتخانە ئەکرد کۆمەڵێك لە بەکرێ گیراوەکانی ئینگلیز لە سەرۆکەکانی هۆزی سەنجاوی هەڵمەتیان بردە سەر هۆزی دەلۆی شۆرششگێڕ).

**پەراوێزەکانی بەشی یەکەم:**

١- مەزبەتە (مضبطة) — بەو داواکاریە ئەوترێ کە کۆمەڵێك خەڵك بۆ هاتنە بەرهەمی مەبەستێکی گشتی مۆری بکەن، لەو ساڵەدا کە داگیرکەری بەریتانی هاتە عیراق و خەڵکی چەوساندەوە، ئەو خەڵکە لە هەموو لایەکەوە دەستیان کردە مەزبەتە ئیمزا کردن و بۆ کاربەدەستانیان بەرز کردەوە، ئەمە بەپلەی یەکەمی خەبات ئەژمێردرێ.

٢- رمیثة — گوندێکە دانیشتووانی (٢٢٥٠) کەسێك ئەبوون، کەوتۆتە سەر لقی (حیللە)ی رووباری (فورات)ەوە، لە نێوان (دیوانیە و سەماوە)دایە لە

(دیوانیه)وه (٦٣) کیلۆمەترەیەك دووره و له (سەماوه)شەوه (٣٦) کیلۆمەترەیه.

٣- هۆسه – بانگەوازێکی باوه لەناو عەرەبدا، نیشانەی هەڕەشه کردنه له دوژمن، خۆ ئامادەکردنه بۆ چوونه شەڕ، "هۆسه" خۆی بریتیه له چەند کورته بەیتێکی پڕ هێز و تەوژم، یەکێك هۆسەکه ئەڵێت و ئەو دواییان بەدەور خۆیان و ئەو کەسەدا سووڕ ئەخۆن و دووپاتی ئەکەنەوه و پێ ئەکوتنه سەر ئەرزا و چەکی دەستیان بەرز ئەکەنەوه.

٤- خان النقطة – کاروان سەرایه کە کەوتووەته نێوان (بەغداد) و (فەلوجە) وه ئێستا (ئەبی منیصیر)ی پێ ئەوترێ.

٥- داگیرکەران بە شۆڕشگێڕانیان ئەوت (ئاژاوەگێڕ).

٦- (مستەفا جەواد ١٩٠٨ – ١٩٦٩) لە سەردەمی منالّیدا له (خالص – دەلتاوه) بووه ئەو کارەساتەی بۆ (د. عەلی وەردی) گێڕاوەتەوه، ئەویش له لاپەڕه پەنجای بەرگی پێنجەمی کتێبەکەیدا (لمحات اجتماعیة من تأریخ العراق) ساڵی ١٩٧٨ بەدوور و درێژی تۆماری کردووه بەتایبەتی گرتنەوەی شاری (دەلتاوه).

٧- محمد سەعید وەنداوی (١٨٨٧ – ١٩٥٤) یەکێك بوو له لایەنگرانی برایم خان، له دەرچووانی کۆلێژی حقوقی عیراقیه، له ساڵی ١٩٢١دا سەرۆکی شارەوانی کفری بووه، له سیەکاندا بووەته ئەندامی پەرلەمانی عیراق و له ریزی ئەو کەسانەدا بوو کە بۆ داوا کردنی مافی رۆشنبیری کورد یادداشتێکی مۆر کرد، چەند ساڵێکیش قائمقامی کردووه.

٨- (مراد موبارەك رحمه الله) سەر بە هۆزی (گێژ)ی دەوروپشتی کفربە، له سەردەمی ئیحتیلالدا بووه سەرۆکی (شەبانه). کە هێزەکه له دانیشتوانی وڵات پێکهاتبوو دوایی هێزی پۆلیسی لێ دامەزرا – موراد بەگ له پۆلیسیدا سەرکەوت تا گەیشته پلەی مودیری پۆلیس و قایمقام، له چلەکاندا له

تەمەنی هەشتادا کۆچی دوایی کرد، پیاوێکی کورتە باڵای زیرەکی ئازابوو، چەند جارێك لە بەغداد چاوم پێ کەوتبوو لەگەڵ (برایم حمە خان)ی گێژ چووبوومە ماڵیان ئەمە لە ساڵانی ١٩٤٢ و ١٩٤٣دا.

٩- مامۆستا مەلا جەمیل بەندی رۆژبەیانی بەرگی یەکەمی یادداشتەکەی کردە عەرەبی و لەساڵی ١٩٥٧دا چاپی کرد.

١٠- (کەلار)ی ئەو سەردەمە بریتی بوو لەدێیەکی (٢٥٠) ماڵی و کەوتبووە رۆژهەڵاتی خوارووی کفری و بەچل کیلۆمەترەیەك لە کفریەوە دوور بوو، دێیەکە مەرکەزی بەگزادەکانی جاف بوو و سەر بە ناحیەی (سەرقەڵا)ی قەزای کفری بوو، لە حەفتاکانەوە لەسەر شەقامی (جەلەولا – دەربەندیخان) نزیك رووباری (سیروان) شارێکی تری بەناو (قەزای کەلار)دوە دروست کراوە و سەر بەپارێزگای سلێمانیە. (کەلار)ی کۆن وەك خۆی ماوەتەوە، بەڵام ئەو مەیدانەی لە نێوان هەردوو کەلارە ئەوەندەی نەماوە بەخانووبەرەی تازە پڕ بکرێتەوە.

١١- (صالح دەلۆیی) یەکێکە لە دەلۆییەکانی ناوچەی سەنگاو، چل ساڵێکە لە سلێمانیدایە، لەوێ دوو ژنی هێناوە و کوڕی ژنی هێناوە و کچی شووی کردووە، خزم دۆست و رۆشنبیرێکی کوردە.

١٢- (وەرمزیار) تیرەیەکە لە هۆزی (بڵباس)، لە هەرێمی (بۆکان)یشدا هۆزێك بەو ناوەوە هەیە، لەناو هەردە تیرەکانی (دەلۆ) وەرمزیاریان تیادا نییە.

بڕوانە: مێژووی کورد و کوردستان بەعەرەبی، چاپی ١٩٧٠، نووسینی (محمد ئەمین زەکی).

١٣- بڕوانە، رۆژنامەی (العراق) رێکەوتی رۆژی ١٩٧٩/٢/١٢ نووسینێك بەناونیشانی (موقع الكرد في ثورة العشرين) نووسینی، زبیر بلال سەعید.

١٤- دەقی ئەم رێکەوتننامەیە لە رۆژنامەی (الاستقلال)ی سەر بەشۆڕشی بیست ژمارە (٤٤)ی شوباتی ١٩٢١دا بڵاو کراوەتەوە.

١٥- مامۆستا (رەفیق حیلمی) لە رۆژنامەی (رۆژی کوردستان) و (النجمة)ی کەرکوکدا بەتورکی نووسینی زۆرە لەو حەلەدا هەوای تورکینزم چووبووە کەللەیەوە، کردەوەی تورکە شۆڤینزمەکان ئەو هەوایەی لە کەللەی دەرکرد.

١٦- نامەیەکی ماجستێرە مامۆستا (خەلیل ئیبراهیم ئەحمەد) لە ساڵی ١٩٧٥دا پێشکەش زانکۆی بەغدادی کردووە، نامەکە بریتیە لە (٦٧٣) لاپەڕە نازانم چاپ کراوە یا نەء؟

١٧- بڕوانە کتێبی (التمرد في بلاد مابین النهرین) نووسینی (أ. ل. هالدین) مامۆستا (فوئاد جەمیل) ساڵی ١٩٦٥ کردویەتیە عەرەبی، هەروەها (شۆڕشی عیراق - الثورة العراقیة) نووسینی (ئەرنۆڵد ویلسن) مامۆستا (جعفر الخیاط) لە ساڵی ١٩٧١دا کردویەتیە عەرەبی و بڵاوی کردۆتەوە.

١٨- نامەیەکە (ل. ن. کاتلۆف) داویەتیە ئامۆژگەی رۆژهەڵاتی سۆڤیەتی سەر بە ئەکادیمی زانستی شەهادەتی دکتۆرای پێ وەرگرتووە، (د. عبدالواحد کرم) بەناونیشانی (ثورة العشرین الوطنیة التحرریة) ئەو نامەیەی کردوەتە عەرەبی کە بریتیە لە (١٩٠) لاپەڕە و لە ساڵی ١٩٧١دا چاپ کردووە.

## بەشی دووەم

## زەمینەی شۆڕش (کفری)

(کفری) وەك وشەیەك لە عەرەبیدا گەلێ مەعنا دەبەخشێ وەك: (کفر، کفرا) داپۆشینی شتێك، (کفر - کفرانا) دژی ئیمان هێنان بەخوا. (کفر) ئەرزێکی دوور لە خەڵکە (کفور) ئاوایی (الکفر) شەوە زەنگ. (کفر) لادێ، لە (سریانیدا - کفرا).

ئەگێڕنەوە کە جێ و شوێنی کفری ئێستا جەنگەڵ بووە داری گەز (کەفر)ی تیا رواوە، بۆیە ووتراوە:

((ناوی ئەم شارە لە (کوفر)ۆ نییە:

لەداری (کفر)ۆ بوو بەم (کفری)یە))[1]

لەلاپەڕەکانی مێژووی نوێ چاومان بەوە نەکەوتووە چۆن و کەی شارە کۆنەکەی (کفری) بووەتە گردێکی (٥٥ پێ) بەرزی، کە ئێستا پێی ئەوترێ (ئەسکی کفری - کفری کۆن) کە بە هەشت کیلۆمەترێك ئەکەوێتە خۆرئاوای شاری کفریەوە.

دێرینترین باسێك چاومان پێکەوتبێت ئەگەڕێتەوە سەر هەزارەی چوارەمی پێش زایین، لەو ساڵانەدا (شنو شیناك)ی پاشای عیلام وڵاتێکی پان و بەرینی گرت و ئەم ناوچەیەشی خستە سەر وڵاتەکەیەوە.

لەچاخی سێیەمدا بنەماڵەی (ئوردا) لە هەزارەی دووەمی پێش زایین (شۆسەن)ی پادشایان دەربارەی ئەو وڵاتە ئەدوێ کە کەوتووەتە باکووری رۆژئاوای وڵاتەکەیەوە ئەڵێت: ئاسایش لەو ناوچەیە بەرقەرارە ژیانی رۆژانەشیان بەشێوەیەکی چاك ئەڕوا بەڕێوە پەیوەندیمان لەگەڵ زۆر باشە. ماوەیەك پێش ئەو مێژووە واتە لە هەزارەی سێیەمی پێش زایین لە سەردەمی حوکمڕانی (شۆڵکی) پاشایان دەبینین (کفری) لە ئیمپراتۆریەتی (ئووڕ) جیابوونەوەیەکی وەرگرتووە و حوکمی ئۆتۆنۆمی ناوخۆی هەبووە، ئەوەندەی پێنەچوو (شۆڵکی) لە

ـالّی بیست و شەشەمی حوکمڕانیەکەیدا هێرشی بردە سەر خاکی (لۆلۆ) و (گۆتی) و بەسەر کفریدا تێپەڕی و ئەو نیوە سەربەخۆییەی قوتدا، زانا شوێنەوارناسەکان ئەڵێن (کفری) بریتی بووە لە قەڵایەکی سەر سنوور و خەتی هامشۆ کردنی بۆ باکووری ئێران پارێزگاری کردووە، پاش ئەوە تا ماوەیەکی دوور و درێژ ناوی لەسەر گوزەشتە و یادداشتی هیچ پادشا و مێژوونووسێکدا نەهاتووە، تا سەردەمی (بابل و ئاشوور) بەناو (کیرۆ) و دووبارە سەری هەڵداوەتەوە، چونکە لە (کیرۆ)وە (قیر)یان بردووە وەك کەرەستەیەك بۆ دروست کردنی خانوبەرە بەکاریان هێناوە، ئەم شارە لە سەردەمی (سلوقیەکان ٢٢٦ – ٦٤١)ی زایینی وەك شارێکی گرنگ و کارگەر ناوی کەوتبووە ناوەوە، (سۆمەر)یەکان بە (کیماش) و بابلی و ئاشوریەکان بە (کیرۆ) و عەرەبەکانی ئەو چاخەش بە (کفری) ناویان هێناوە[٢].

کاتێ ناوی (گۆتی) لەسەر شانۆی زەمان نەما لە باکووردا چەند پاشانشینێکی (مملكة) بەهێز سەریان هەڵدا وەك (پاشانشینی ئوربیلیۆم – أربیل) و (خارشە) واتە دوزخورماتوو و (کیماش) واتە –کفری-، لە چاخی ئوری سێیەمدا پەیوەندی نێوان باکوور و باشوور کەوتە قاڵبێکی نوێوە، ئەو سەرچاوانەی لەشوێنەوارەکانی (لکش) و (ئۆما) دەست کەوتوون و ئەوە ئەگێڕنەوە کە دانیشتووانی باکوور بەوە ناوبانگیان دەرکردووە کە لە شەڕدا سەربازێکی کۆڵنەدەرن و لە ماڵ و ماڵات لەوەڕاندندا شوانێکی پوختن و هەروەها جوتیارێکی بەسەلیقەن لە هەڵکەندنی نۆکەند و کارێزە ئاو، ئا ئەو دانیشتوانانە لەژێر ڕکێفی (ئور)دا نەبوون، بەڵام پەیوەندیان لەگەڵ کاربەدەستانی ئوردا پتەو بوو گوێ رایەڵیان ئەکردن.

لە پارچەی گڵێکی دۆزراوەی سێ هەزارەی پێش زایین لە سەردەمی (شۆسن)ی پادشای بنەماڵەی ئوری سێیەمدا ئەوە دەگێڕنەوە کە (شلیبوم) فەرمانڕەوا بووە لەگەڵ فەرمانڕەواکانی ئوردا کاغەزیان بۆ یەکتر نووسیەوە و

نوێنەریان لەنێواندا هەبووە، بەتایبەتی لەشاری (کیماش)ەوە لە سەردەمی پادشای بنەماڵەی ئوڕی سێیەم ناوی (پیاوەکەی کیماش) هاتووە، لەمەوە بۆمان دەرئەکەوێ کە (کیماش – کفری) فەرمانڕەوایی خۆی بەدەستەوە بووە، (شولکی) لە ساڵی بیست و شەشەمی فەرمانڕەواییەکەیدا هەڵی کوتایە سەر وڵاتی (لۆلۆ) لە ساڵی چل و شەشەمی فەرمانڕەواییەکەیدا، فەرمانڕەوای (خارشە – دوز) ورچێکی بەدیاری بۆ نارد، خارشەی ئەوسا نزیك بەکیماش بووە، زۆر کەس لەو باوەڕەدان کە (شیمۆر و کیماش) واتە (کۆپری و کفری) بریتی بوون لەدوو قەڵای سەر سنوور بۆ پارێزگاری کردنی رێگەی ئامشۆ کردن[٣].

دیسانەوە ناوی (کفری) لە لاپەڕەکانی (مێژوو)دا بەم چەشنەش هاتووە ((لە رۆژی شەشەمی مانگی حوزەیرانی ٣٦٣ی زایینیدا سوپای ئێران ئابلۆقەی سوپای رۆمانیەکانیدا کە هێرشی هێنابووە سەر شوێنێك نزیك بەشاری (ڤرجیا - کفری) لەو شەڕەدا ئیمپراتۆری رۆمان (جولیا) بریندار کرا و بەسەر ئەو برینەیەوە مرد))[٤].

لەو سەردەمەدا کە ناوی (کیماش - ڤرجیا) لە ئارادا بووە شارێکی گەورە بووە، لەسەر رووبارەکەی ئێستای کفری ئاو بەستێك دروست کراوە لەوێوە جۆگە ئاو هەڵکەندراوە[٥] تا گەیشتوەتە شاری (ڤرجیا، ئەسکی کفری) دەوروپشتی ئەو شارە هەموو باخ و بێستان بووە، ئەو ئاوبەستە گەورەیە لە سەردەمێکی مێژوودا پشت گوێ خراوە لافاوێکی گەورە تەنگی لێهەڵچنیوە و هەرەسی پێهێناوە[٦] و ئاوەکە لە رووبارە دروست کراوەکەوە وەرچەرخاوەتە سەر رووبارە سروشتیەکەی ئێستای. لەسەردەمی ئیسلامدا ناوی کفریمان لە هیچ سەرچاوەیەکدا بەرچاو نەکەوتووە، دوور نییە شارە کۆنەکەی کفری لە ئەنجامی کارەساتێکدا نەڕوخابێت و تەنها کەلاوەکەی مابێتەوە ئەویش ساڵ لەدوای ساڵ ئەوەندە خۆڵی کەوتبێتە سەر تا بووەتە ئەو گردەی کە لەبەرچاوە.

(کفری) ئەم رۆژگارەمان کەوتووەتە بەرپێی شاخی (باوەشاسوار - بابا شاهسوار) و لەلای رۆژهەڵاتەوە رووبارێك ئەکەوێتە نێوان شارەکە و ریزە شاخەکەوە، ئەو رووبارە لە هاویندا ئاوێکی کەمی پیادا ئەڕوات کەچی لە زستاندا ئاوی زۆری پیادا ئەڕوات.

**لە سەرچاوەکانی سەردەمی عوسمانیدا بەم جۆرە ناوی (کفری) هاتووە:**

١- جوغرافیای عوسمانی[٧]: کفری مەرکەزی قەزای (صەلاحیە)یە، چەند رووبارێك لەناو ئەو شارەوە تێئەپەڕن، خورما و لیمۆ لە کفریدا زۆرن.

٢- سالنامەی عوسمانی[٨]: قەزای (صەلاحیە) کەوتووەتە رۆژهەڵاتی باشووری لیوای کەرکوکەوە -ئەوسا کەرکوك لیوایەك بووە سەر بەولایەتی موسڵ بووە- لە کەرکوکەوە بیست و چوار سەعاتە رێ دوورە، شارەکە کەوتووەتە دەشتاییەکی بەپیت و بەرەکەت هەزار خانەی تیادایە و سەرژمێری هەشت هەزار کەسێکە سەرایەکی حکومەت و دوو مزگەوت و دوو تەکیە و قوتابخانەیەکی (روشدیە) و واتە متوسطة -دوو قوتابخانەی (صبیان)-واتە سەرەتایی- و پۆستە خانەیەك و دوو گەرماوی هەیە (٩) چاخانە و چوار بازاڕ و (٦٧٥) دوکانی هەیە لەو دوکانانە چواریان بۆ بەن رەنگ کردنە، لە کفریدا (٣٥) ئاسیاو و هەشت باخی گەورە و (٣٢) باخچە هەیە، (٢٣٢) موقاطعە هەیە و نۆ جۆگە ئاو خاکەکەیان ئاو ئەدات، دوو ناحیە سەر بەقەزای (صەلاحیە)ن (دوزخورماتوو) و (قەرەتەپە).

**ناوی کاربەدەستانی ئەو سەردەمەی کفری:**

ولی‌الدین ئەفەندی (قایمقام) ئیسماعیل ئەفەندی[٩] (مفتی) عارف حیکمەت (نائب) (حسین ئەفەندی - مدیر مال).

ئەندامەکانی شارەوانی (موسا بەگ[١٠]، سید محسن ئاغا[١١]، عثمان ئەفەندی[١٢]، هارون ئەفەندی سەرۆکی شارەوانی (ئەمین ئەفەندی) نووسەری شارەوانی (شەفیق بەگ) ئەندامی محکەمە (سەید خەلیل ئاغا و صالح ئەفەندی)).

لە سەردەمی عوسمانیدا لە کفری باشکاتب (کاتب أول) و کاتبێکی تر و (مستنطق - واتە محقق) و موباشر و دەرگەوان لە مەحکەمەدا هەبووە، جگە لەمانە لە کفری ئەم فەرمانبەرانەش هەبوون (وەکیل ئەوقاف) کاتبی وێرگی - زەریبە - باج وەرگر-، مەئمور قەرزی گشتی، مودیری پۆستە، مەئمور رێژی، کاتبی بەنق، ناوی هەمووشیان تۆمار کراوە[١٣].

٣- قاموس الاعلام[١٤] - قەزای (صەلاحیە) ئەکەوێتە بەشی خوارووی سەنجەقی شارەزوورەوە (واتە لیوای کەرکوك)، کفری مەرکەزی قەزایە، رووباری دیالە ئەکەوێتە سنوری بەشی خوارەوەی، لە قەزاکەدا چەند رووبارێك هەیە، خاکەکەی بەپیتە، گەنم و جۆ و لیمۆی زۆرە، (١٥٨) ئاوایی سەر بەم قەزایەیە، سەرژمێری شارەکە چوار هەزار کەسێکە، لەناو شاردا هەشتا جولەکە هەیە، ئەودوایی دانیشتوانی شار هەموو موسڵمان و زۆریان شیعە مەزهەبن[١٥].

## کفری لە سەرچاوەکانی عیراقدا:

١- موجز تاریخ البلدان العراقیە[١٦]: ناوی دووەمی (صلاحیە)یە، سەر بەلیوای کەرکوکە و بە (٧٨) میل لێوەی دوورە، ئاو و هەوای خۆشە، سەرچاوەی رووبارەکەی لە دوو شوێنەوە هەڵ ئەقوڵێت (سەر قەلعە و قوشە چاپان) لە نزیك کفریەوە (قیر) لە گوندی (ناصالح) دەردەهێنرێت، لە شەڕی یەکەمی جیهانیدا ئەڵمانەکان سوودیان لێ بینیوە، کفری سێ ناحیەی هەیە (دوز - قەرەتەپە - شیروانە) سەرژمێری شاری کفری (٧٠٥٩) کەسە و سەرجەمی قەزاکەش (٤٩٣٤٩) کەس ئەبێت.

٢- المرشد إلى موطن الآثار والحضارة[١٧]: له دووریانی نێوان دوز و سلێمان بەگەوە ئەچێتە کفری، ئەو مەسافەیە نزیکەی (٣٣) کیلۆمەترەیە، بەدەستە چەپدا ئەڕوانێتە شاخێك جۆرە بەردێکی تیادایە ورد ئەکرێ و رەوانەی کارگەی چیمەنتۆی بەغداد ئەکرێ[١٨]، کە لە کفری نزیك ئەبیتەوە گردێکی زۆر گەورەت ئەکەوێتە دەستە راستەوە –ئەو گردە گردی ئەسکی کفریە-. کفری کەوتووەتە پاینی شاخی (باباشاهسوار) نیسبەت بەناوی خواناسێك لەسەر لوتکەی ئەو شاخە نێژراوە، شاخەکە زۆر بڵند نییە بەردەکەی وەك بەردی شاخی حەمرین وەهایە، چاوگەیەکی نەوت نزیك کفری هەیە نەوتی پیادا ئەچۆڕێت، چاوگەیەکی قیریش لەو نزیکە هەیە، جاران تورکەکان قیریان لێ دەرئەهێنا. ناوی (کفری) لە (کفر)ەوە هاتووە بەعەرەبی نەوعە (قیر)ێکە کە ئەویش لە (کیرۆ)ی بابلی و ئاشوریەوە بۆمان ماوەتەوە، هەرێمی کفری بە دانەوێڵە چاندن بەناوبانگە.

له نزیك کفری چەند شوێنەوارێك هەیە وەك شوێنەواری (قەرە ئۆغلان)[١٩] لەوێ کەلاوەی چەند بینایەك ماوەتەوە کە لەبەرد و گەچ دروست کراوە و هەندێ نیگاری گەچیشیان پێوە ماوەتەوە. لەسەر لوتکەی بابا شاهسوار شوێنەواری گردێکی دەستکرد هەیە (قزلر قەلعەسی)[٢٠] پێ ئەڵێن. لە هەشت کیلۆمەترە دوور کفریەوە کەلاوەکانی (ئەسکی کفری - کفری کۆن) هەیە وازانراوە کفری جاران لەو شوێنەدا بووە بڵندایی ئەم گردە (٥٥) پێیە، خشتی گڵی سوورەوە کراوی تیادا دۆزراوەتەوە ئەمەش ئەگەڕێتەوە سەردەمی فەرثی و ساسانیەکان. لە جەلەولایشەوە بۆ کفری رێگەیەك هەیە (٧٤) کیلۆمەترە ئەبێت، هەروەها لە نێوان کفری و قەڵای شیروانە رێگەیەك هەیە.

٣- گۆڤاری (الأخاء التركمانية)[١٣] - کفری سەر بەپارێزگای کەرکوکە و کەوتووەتە بەشی رۆژهەڵاتی باشووریەوە بە (١٣١) کیلۆمەترە لە کەرکوکەوە دوورە خەتی شەمەندەفەری (بەغداد - کەرکوك - ئەربیل) بە پانزدە کیلۆمەترە لە رۆژئاوای کفریەوە تێئەپەڕێ و شارەکە ئێستگەی (ئەسکی کفری) هەیە، کفری ناکەوێتە

سەر ڕێگەی (بەغداد - کەرکوك)، بەڵکو لەو ڕێگایەوە لە نزیك سلێمان بەگەوە ڕێگەیەکی تایبەتی بۆ ئەچێت درێژیەکەی (٣٥) کیلۆمەترەیە. لە هەندێ کتێبی مێژووی عەرەبدا وا دەرئەبڕێت کە ناوی ئەم شارە لە (کفر)ەوەیە ئەویش نەوعێکە لە (قیر) هەروەها کفری لە عەرەبیدا بۆ گوند بەکار ئەهێنرێت. وا ئەگێڕنەوە کفری لە دێریندا لە (ئەسکی کفری) بووە و بەداری (کفر - گەز) ئابلۆقە دراوە.

لەسەردەمی عوسمانیەکان بەشارەکە (کفری) ووتراوە و بەقەزاکەش (صەلاحیە) - لەدوای داگیر کردنی بەریتانی ناوی (صەلاحیە) نەماوە، ئەوساکە کفری لە (ئەسکی کفری) دابووە مەرکەزی میرنشینی (بەیات) بووە و رووبارەکەی بەتەنیشتەوە بووە، کە ئاوڕێژی رووبارەکە ڕێگەکەی گۆڕی (کفری)یش جێی خۆی گۆڕی و چووە سەر ئاوڕێژە تازەکەی کە شوێنی ئەمڕۆیەتی، (ریچ) لەساڵی ١٨٢٠دا لەم شارەوە تێپەڕیوە. لەدەوروپشتی کفریدا چەند شوێنەوارێك هەیە وەك (ئەسکی کفری، قەرەئۆغلان، قزلر قەلعەسی، یەدی مەغارە)[٢٢].

دانیشتوانی کفری جاران هەموو (تورکمان)[٢٣] بوون، پاش ساڵی ١٩٤٠ و لەکاتی شەڕی دووەمی جیهانی لە سەرەنجامی بێ کاری و برسێتی کوردەکان بە خاوخێزانەوە روویان تێکرد، پاش شۆڕشی ١٩٥٨ کۆچ کردن بۆ شارەکە شێوەیەکی فراوانی وەرگرت ئەمیش کاری کردە سەر باری ئابووری شارەکە و ئاسایشی دانیشتوانی تێکدا، لە سەرەنجامدا (١٢٠) خێزان لە کفریەوە چوون بۆ (کەرکوك) و (١٠٠) خێزانیش روویان کردە بەغداد و شارەکانیتر تا وەهای لێهات تەنها (١٥٠) خێزانە تورکمان لە شارەکەدا ماونەتەوە[٢٤].

لە کفریدا شاعیری وەك (خەلیل منەوەر، مەلا مستەفا، مستەفا ڕێژی) هەبووە، ئەمڕۆش (رەفعەت یۆلچوو حەکیم مستەفا ڕێژی) لە شاعیرانی ئەم شارەن.

له كفری سێ قوتابخانەی كوڕان و دووی كچان و دوو قوتابخانەی ناوەندی و كتێبخانەیەك و سینەمایەكی هاوینی هەیە، هەروەها نەخۆشخانەیەك كە ٢٤ قەرەوێڵەی تێدایە.

هەرێمی كفری لە دوو سەدەی رابوردوودا چەند شەڕێكی قورسی بەخۆیەوە بینیوە، لەسەردەمی (بەكر بەگی كوڕی میر محمد سلێمانی) برای سلێمان پاشای گەورە (١١١٥ كۆچی – ١٧٠٢) زایینی سنووری میرنشینی بابان ئەوەندە فراوان بوو تا سەرزەمینی نێوان زێی بچوك و سیروانی گرتەوە، ریزە شاخەكانی نێوان ئاڵتون كۆپری و هەرێمی كفری كەوتبووە ناو وڵاتی بابانەوە[٢٥]، هەروەها لە ساڵی ١٨٧٠دا شەڕێكی قورس لەم ناوچەیە نزیك دێی (دوانزە ئیمام)[٢٦] نێوان هێزێكی چەركەس كە بریتی بووە لە (٥٠٠) سوارە و هێزێكی هەمەوەند قەوما، چەركەسەكان لەم شەڕەدا شكان و (رەئوف) پاشای والی بەغدا ناچار لەگەڵ هەمەوەندەكان رێكەوت، هێزی هەمەوەند سەرەنجامی ئەم رێكەوتنە چوونە بەرەنگاری كردنی هێرشەكانی هێزی رووس.

(كفری) كەوتبووە سەر شارێگەی كاروانی نێوان بەغداد و سلێمانی و زۆربەی ئەو گەڕیدانەی بەرەو كوردستان رۆیشتون لەم شارەوە تێپەڕیان كردووە و لەیادداشتەكانیاندا ناویان هێناوە، وەك:

١- نیبور: لە ئاداری ١٧٦٦دا بەرێگە راستەكەی بەغدادەوە بەرەو (یەنگیجە)[٢٧] رۆیشتوە و لە حەوتی ئاداردا گەیشتوەتێ، لە شوێنێك لەسەر هێڵی پانی (٣٣) دەرەجە و ٥٧ دەقیقە لە شاری (كرفە)وە نزیك بووەتەوە – مەبەستی لە كرفە كفری بووە - كە یەكێك لە خەلیفەكانی عەبباسی سەردەمی سامەڕا دروستیان كردووە[٢٨].

٢- گەشتەكەی (جێمس بكنغهام)[٢٩] – ساڵی ١٨١٦ ئەو گەشتەی كردووە، لە ٢٧ی مایسی ١٨١٦ لە حەلەبەوە دەستی پێ كردووە، لە رووباری (فورات) پەڕیوەتەوە و چووەتە (ئورفە) و (ئوسا) لەوێوە چووەتە (ماردین و دیار بەكر) و (سنجار و

موسڵ) دوایی چووەتە (هەولێر و عەنکاوە و کەرکوك) لە گەڕانەوەشدا چووەتە کفری و قەرەتەپە و گەیشتوەتە بەغداد، کە بەکفریدا تێپەڕیوە ئەم یادداشتەی تۆمار کردووە (١٢ی تەمموز: کفری کەوتووەتە دەشتاییەك لە پاینی زنجیرە شاخێکی وشك و بەرینەوە. شارەکە لەناو شورەیەکدایە خانوەکانی بەقوڕی تێکەڵ بەوردەچەو دروست کراوە. جۆگە ئاوێکی روون لە رۆژهەڵاتی شارەوە ئەچێتە ناو شار و جۆگەلەی زۆری بۆ ئاودان لێ ئەبێتەوە و بەناو کوچە و کۆڵانەکانی شاردا دەڕوات و دەبنە هۆی پاك و تەمیزی شارەکە، لە سەرەوەی شوورەکەی شاردا قوللەی بۆ دروست کراوە، لە هەموو لایەکیەوە لوولەی تفەنگی لێوە دیارە، بەپێپلکانەی تەسك و تروسکەوە دەتوانیت بگەیتە ئەو قوللانە، تیادا هیچ تۆپێکم بەچاو نەبینی، دیمەنی بازاڕی شارەکە مایەی بەزەیی پێهاتنە، کەل و پەل و شت و مەکی تیادایە، کاڵەك و ترێی چاکم تیا بینی، چێشتخانەیەکی تیایە کەباب و گۆشت و سجوقی برژاوی تیادا هەبووە، یەك چاخانە لە شارەکەدا هەبوو ئەویش شوێنی دەست بەتاڵەکانی ناوشار و میوانەکانی شار بوو.

ئەو خانوەی کە تیادا میوان بووین هەر لەو خانووە ئەچوو کە لە ناو بەیات چاومان پێ کەوتبوو لەسەر شێوەی تورکی دروست کرابوو، بریتی بوو لە چەند ژوورێك هەریەکێکیان وەك ژوورەکانی ئەوروپا (موغەیری - زوپا)یەکی ناو دیواری تیا دروستکرا بوو. لەناو هەندێ لە ژوورەکاندا تەخت بۆ میوانەکان دانرابوون، دیوار و بنمیچ و گومەزی ژوورەکان لەسەر شێوەی تورکی بەنەخش و نیگار رازابوونەوە، چوخمەکانی - تەوق - طاق - ناو شار و خانووبەرەکانی شێوەیەکی ئیسلامی پێوە بوو، بەڵام لەناو شاردا چەند چوخمێکم بینی (خڕ) بوون هەر لە چوخمی رۆمانی دەچوون جگە لەوەی چەند چوخمێکی سادە و راستم بینی لە چوخمی سەکسۆنی دەچوون.

زمان و شێوەی دانیشتوانی ناو شار لە تورکمانیەوە نزیك بوون، ئەمەش ئەوەمان بۆ دەرئەبڕێت ئەم شارۆچکانە کە لە گوندێکی گەورە دەچن لە سەردەمی

خۆسمانیەکاندا بۆ ئاڵوگۆڕ کردنی پۆستە دروست کرابوون پاش ئەوە لە سێتەکانی دەوروپشتەوە خەڵکیان تێ هاتووە و گەورە بوون، دووری نێوان ئەم شارۆچکانە[٣٠] وەك یەکن و لە نێوانیاندا لە دەشتاییەك بەولاوە هیچ گوندێك بەرچاو ناکەوێت، ئەمە مایەی سەرسوڕمان نییە دانیشتوانی ئەم شارۆچکانە کە کەوتونەتە سەر رێگەی پۆستەی (ئەستەموڵ - بەغداد) شێوەی تورکیان پێوە بێت و بەتورکی کە زمانی رەسمی ئەو سەردەمە بووە قسەیان نەکردبێت، ئەم شارۆچکانە وەك دوورگە کەوتبوونە نێوان کورد و عەرەبەوە.

چەند باخێکم لەناو شارەکەدا بینی دار مێو و دارە خورمای تیادابوو کە چوومە ناو یەکێك لەو باخانەوە کرمێکم بینی لە کرمی ئاوریشم دەچوو، دنیا زۆر گەرم بوو پلەی گەرما لە نیوەڕۆدا گەیشتبووە (١٢٠) پلە، لە سەعات دووی پاش نیوەڕۆ گەیشتە (١٢٥) پلە.

دەمەو عەسر بانگ کراینە ماڵ (حاجی حەبیب) ناوێك، کە چووین هۆی دواکەوتنی سەفەرەکەمانی پرسی و ئامادەیی یارمەتیدانی پیشاندا، پاش رۆژئاوابوون کۆمەڵە خەڵکێك هاتنە ماڵ حاجی یەکێکیان مەلایەکی لەڕولاوازی ریش تۆپ بوو، هەندێ لە پیاوە ناودارەکانی شاریش هاتن پێکەوە نوێژیان کرد ئێمە بەشداریمان نەکردن، پاش ئەوە هەستاین چووینە کەناری رووبارەکە لەوێ هەمووومان شیوێکی زۆر چەور و بەتاممان خوارد، لەناو ئەو خەڵکە دوو دەروێش هەبوون زۆر ئالوودەی حاجی ببوون و هەمیشە لەگەڵیا بوون، دوو سەعات پاش رۆژئاوا بوونی ئەو ئێوارەیە کفریمان بەجێهێشت، کاروانەکەمان بریتی بوو لە شەش ئەسپ سوار و پەنجا هێستر سوار و دوو پۆستەچی کە لە موسڵەوە هاتبوون. بکنغهام سەرژمێری کفری بەسێ هەزار کەسێك داناوە و وێنەیەکی بەدەست خەت خۆی بۆ شاری کفری کێشاوە و لە یادداشتەکەیدا بلاوی کردۆتەوە[٣١].

٢- گەشتەکەی مستەر (کلۆدیۆس ریچ)[٣٢]:

ساڵی ١٨٢٠ مەحمود پاشای میری بابان مستەر(ریچ)ی بۆ سلێمانی دەعوەت کردووە، ئەمیش لە بەغداوە بۆ گەشتێکی لە سلێمانی دوورتریش کەوتووەتە رێ و بەگفریدا تێپەڕیوە و ئەمەی لەسەر نووسیوە: (رۆژی ٢٥ی نیسان — لەسەر چەند گردێکی پڕ چەو و بەردەوە تێپەڕین، قەرەتەپە ئەکەوێتە لای رۆژئاواوە، ئەولامان لە قۆڵێکی درێژی لێژەوە ئەچووینە خوارێ بۆ دۆڵێکی بچووك، چووینە خوارەوە سەعات حەوت و چارەکێك گەیشتنە پردی (چیمەن) لە سەعات نۆ و دە دەقیقەی ئەو رۆژەدا لە خڕێکی پان و بەرین پەڕینەوە ئەودیو، نزیك بەرزاییەك بۆ قاوە خواردنەوە دابەزین، لە سەعات دە و بیست دەقیقە کەوتینەوە رێ بۆ سەعات پانزدە گەیشتینە (کفری)، لە کفری سەرۆکی شارەوانیمان نەبینی تومەز بە پانزدە سوارەوە چووەتە لای ئەوخرە (چەمە ئاوە) بۆ چاوەڕوانی کردنی ئێمە، بەپێچەوانە چووین یەکترمان نەبینیوە. تەختە رەوانەکەش[٣٣] لە سەعات شەش دەرچوو بوو لە سەعات پانزدەدا پێمان گەیشت. زۆرم لا سەیر بوو چەند خێزانێکی جوولەکە هەبوون کە نیشتێکیان بۆ خۆیان دروست کردبوو، بینیم خەڵکەکە گیایەکی پیاز نیسبەت سوور ئەکەنەوە و ئەیخۆن، بەقەد کەستنایەك ئەبێت (جەزەدۆم - چەدەنە)ی پێ ئەڵێن، پلەی گەرما لە سەعات سێی پاش نیوەڕۆ (٨٢) بوو بۆ سەعات دەی شەو هاتە خوارەوە و بووە (٦٤) پلە.

٢٦ی نیسان چوومە سەر چەمی کفری شەوێ باران باریبوو بەرۆژ بناغەیەکی دیواری نزمی کۆنی دەرخستبووە دەرەوە، لەسەر دیوارەکە چەند پارچە مەڕمەڕێکم بینی دیوارەکەی پێ رازابووەوە، دەستم کردە هەڵکۆڵینی دیوارەکە بینیمان لەسەر دیوارەکان وێنەی گوڵ نیگار کێشراوە بە رەنگێکی سووری بریقەدار، رەنگی خەتە سەرەکیەکان رەش بوو، شوێنەواری پێنج شەش تاکە ژوورمان بینی هەندێکیان لای دەستە چەپەوە کۆڵەکەی بۆ کرابوو، بەدیوی رۆژهەڵاتدا گردێکی بەرزمان بینی کرێکارەکانی ئەو ناوە چەند پارچە گۆزەی

ـۆزدوەكراويان بۆ هێناین كە بەڕەنگی ڕەش بۆیە كرابوون لەوانە ئەچوون كە ـ (بابل) و (سلوقیە) دۆزرابوونەوە، ئەو پارچە خشتانەی بەرچاوم كەوتن بۆی ـەرخستم كە ئەم شوێنەوارانە هی سەردەمی ساسانیەكانن، لەسەر لوتكەی ئەم گردە بەرزە شوێنەواری چەند بینایەك هەیە زۆربەی ئەم جۆرە بینا كۆنانە ژێر خنی چوار گۆشەییان هەیە وەك ئەوانەی (قەسر شیرین و حەوش كەڕەك).

ـرێژایی رووبەری ئەم كەلاوە و شوێنەوارانە نزیكەی میلێك و پانیەكەشی چارەكە ـیلێكە، چەند شوێنێكمان لێ هەڵكۆڵی شتی ئەوتۆمان تیا دەست نەكەوت، ـەدەستە چەپی ئاوڕێژی چەمەكەی كفری شوێنەواری دیوارێك هەیە كە لەوێوە ـەیەڕێتەوە بەرەو كفری، لەناو ئاوڕێژەكەشدا چەند پارچە دروست كراوێكی گەورە كەوتوون، وا دیارە ئەمە لە وەختی خۆیدا بینایەكی دروست كراوبووە، ـەوژمی لافاوی ئەم رووبارە روخاندویەتی،دانیشتووانی ناوچەكە ئەڵێن ئەو پارچە گەورانە پاشماوەی ئاوبەستێكی گەورە بووە، بەڵام بە بۆچوونی من شوێنەواری شوورەی شارەكەیە دوور نییە ئەم كۆتكە بەردانە لە دێریندا بەر ئاوەكەی پێگیراوە بۆ ئەوەی ئەو ئاوە بۆ كشتوكاڵ لەدەشتاییەكەدا بەكار بهێنرێت.

دانیشنووانی ناوچە ئەم جۆرە شوێنەوارانە بەهی (گاور - كافر)یان دەزانن، لە رۆژئاوای باكووری ئاوڕێژەكەدا شوێنەواری هەڵكۆڵین لەسەر بەردێكی گەورە لە بەرچاوە بەوە ئەڵێن (ماڵی گاوران)، مستەر (بەل لی تو) بۆ چاوپێكەوتنی هەندێ لە شوێنەواری سەر ئەو گردانە چووبوو كە بەسواری دە دەقیقەیەك ئەبێت لەوێ چاوی بەچەند گۆڕێكی زوور ئاسایی كەوتبوو، دەرگاكانیان نزم بوون لە ناویاندا سێ شوێنی بچووك هەبوو لاشەی مردووی تیادا بوو درێژی هەریەكەیان پێنج پێ دەبوو، بناغەی ئەم گۆڕانە لە بناغەی گۆڕی (ئەخمینی)یەكان دەچوون، لێرەوە بە ماوەی سێ میلێك لەسەر گردەكە - مەبەستی لە لوتكەی شاخی باوە شاسوارە و - شوێنەواری دروستكراوێك هەیە (قیز قلعەسی) پێ ئەڵێن چەند پارچە گڵین و ئێسكمان تیا دۆزیەوە، ئیتر لەم ناوە

شتی ئەوتۆی تر نییە ئەوی شیاوی باسکردن بێت ئەمەیش ئەکەوێتە بەرامبەر گوندی دوانزدە ئیمامەوە.

کە گەڕاینەوە بۆ خێوەتەکانمان نێراوەکەی مەحمود پاشای سلێمانیمان چاو پێکەوت چاوەڕێی ئەکردین و هاتبوو لە گەیشتنمان بۆ کفری دڵنیا بێ، هەردوو نێراوەکانی پاشا ئەمرۆ گەڕانەوە سلێمانی بۆ ئەوەی پاشا رابەر — میوانداریێکمان- بۆ پێشوازی کردن بنێرێتە (قەرە حەسەن)، چونکە بڕیارمان دابوو لەبەر ئاسانی رێگەکە بۆ تەختەڕەوان لەو رێگەیەوە بچینە سلێمانی.

لە کفریدا چەند دار خورمایەك هەبوو بیستمان گوایە بەرناگرن بە پێچەوانەی دارخورماکانی دوزخورماتووەوە، لەو ماوەیەی لە کفریدا بووین لافاو چەند لایەکی ئاورێژەکەی فرە تاشیبوو.

پلەی گەرما لە سەعات سێی پاش نیوەڕۆ گەیشتبووە (٨٢) هەواش لە باکووری رۆژئاواوە هەڵی ئەکرد.

٢٧ی نیسان: ئەمرۆ چووین بۆ بینینی شوێنەوارەکانی (ئەسکی کفری) کە کەوتووەتە باشووری رۆژئاوای کفریەوە، لە پێ دەشتێکدایە دوو سەعات لە شارەوە دوورە. وام ئەزانی شوێنەواری ئەم گردە شوێنی شاری کفری جاران بووە، بەڵام بۆم دەرکەوت کفری ئەوسا و ئێستا هەر لەم شوێنەیدا بووە، لە رێگەماندا چاومان بەچەند ئاسیاوێك کەوت هەریەکەیان قوڵەیەکی بچووکی هەبوو کەوتبوونە ناو باخەکانی کفریەوە، بۆ هەر ئاشێك جۆگەیەکی ئاو دروستکرابوو لەسەرەوە بەرەوخوار بۆ ئاسیاوەکە بەتەوژم ئاو ئەهاتە خوارێ و ئاسیاوەکەی ئەخستە گڕ.

لەنزیك ئەسکی کفریەوە گردێکی دەستکردی گەورە هەبوو لە گردەکەی (مجیلیبە) دەچوو دامێنی گردەکە راست هاتبووە خوارەوە بارانا و هەڵی دڕیبوو لەیەکێ لەو درزە هەڵکەندراوانەدا گومەزەیەکی بچووك دەرکەوتبووکە بەخشتی سورەوەکراو دروست کرابوو پارچە گڵی زۆریان تیا دۆزیبووەوە لەگەڵ چەند پارەیەکی زێڕین، هیچ پارەیەکم لێ دەست نەکەوتن. درێژی ئەم گردە لەخوارەوە

بۆ ژوور نۆ سەد و شەست پێ بوو پانیەکەشی لە ڕاستەوە بۆ چەپ لەوە کەمتر بوو بەرزاییەکەشی پەنجا و حەوت پێ بوو، لە تەنیشت کەندرەکانەوە هەندێکمان پێ هەڵکەند وردە ئێسکی ئادەمیزاد و چەند پارچە گڵێنەیەکمان لێ دۆزیەوە لە ناوەوە هەمووی بەبۆیە ڕەش کرابوو، لەسەر چەند پارچە گۆزەیەکدا وێنەی ئاسك و مانگامان لەناو کۆمەڵە بازنەیەکی بچووکدا بەرچاوکەوت هەرچیمان دۆزیبووەوە لەگەڵ خۆماندا هەڵمان گرت و بردمان. هەرچەندە ئاودرەکەمان هەڵئەکەند خۆڵێکی بۆگەنی ڕەشمان ئەبینی لەگەڵ پارچە گۆزە و وردە ئێسقاندا گومانمان لەوەدا نەما کە ئەم گردە ساسانیەکان بۆ ئەوەیان دروستکردووە کە لاشەی مردووەکانیانی تێ فڕێ بدەن، لە ڕۆژئاوای باکووری ئەم گردە شوێنەواری گردێکی بچووك ئەبینرێ ئەمەش ئەوە ئەبینی ئەم پێدەشتە بۆ نیشتەنی دلگیر بووە، لە ڕۆژهەڵاتی ئەم گردەش گردێکی لەوان گەورەتر هەیە کە (ئاش طوقان)ی پێ ئەوترێت و لەرێگەی گەڕانەوەمان بۆ خێوەتەکانمان پاش چارەکە سەعاتێك گەیشتینە شوێنەواری شوورەیەکی بچووك ڕەنگە شوورەی شارەکە بووبێت، لەو شوورەیە شوێنەواری سێ سەد یاردەیەکی ماوە بەرزاییەکەی چەند پێیەکە، شوورەکە بەبەردی خڕ دروستکراوە. سەعات دە و چارەکێ لە ئەسکی کفریەوە کەوتینەڕێ بۆ سەعات دوانزدە گەیشتینەوە کفری. لەم دواییەدا پارچە گۆزەیەکی ساسانی زۆر نایابم دەستکەوت کە هەندێ نووسینی لەسەر بوو، لە دوانزدە ئیمام کە نزیکەی چواردەمیل لە کفریەوە دوورە گردێك هەیە وا دەرئەکەوێ کەلاوەکانی ئەم گردە و گردە زۆرەکانی تری ئەم ناوچەیە ئەگەڕێنەوە سەردەمی ساسانیەکان. بەرامبەر دوانزدە ئیمام لەناو ریزە گردە بچووکەکاندا چەند سەرچاوەیەکی نەوت هەیە، ساڵێك لەمەوبەر سەرچاوەیەکی بچووکی نەوت لەناو ئەم گردانە دۆزرایەوە کە بەچەند دەقیقەیەك ئەکەوێتە ڕۆژئاوای کفریەوە ئەو کابرا دەشتەکیەی کە ئەم سەرچاوەی دۆزیبووەوە کاربەدەستانی تورك دارکاریان کرد بۆ ئەوەی دان بەوەدا بنێت ئایا پێش ئەوەی ئاگاداری حکومەتی کردبێت هیچی لێ فرۆشتووە یا

نەء؟ سەرەنجامی ئەم دارکاری کردنە ئەو کابرایە کۆچی کردوو رووی کردە ئێران، رێکەوت ئەو کاتەی من لە کفریدا بووم ئەو کابرایەش لە کفریدا بوو، خۆی رووداوەکەی بۆ گێڕامەوە و ووتی: وا دیارە لەبەر زولّم و زۆری تورك خوا بەنەوت دۆزینەوە دڵخۆشیان ناکات، چونکە ئەو کاتەی من ئەو سەرچاوەیەم دۆزیەوە نەوتی فرەبوو، کە لێیاندام چاووگە نەوتەکە وشکی کرد و چەند دڵۆپە نەوتێك نەبێت هیچی تری لێ نایەتە دەرەوە.

گەرما لە سەعات سێی پاش نیوەڕۆ (٨١) پلەیە، سەعات دەی شەو هاتە سەر (٦٦) پلە، سووکە بایەك هەڵی کرد، شەوێ لە رۆژئاواوە با هەڵی کرد و نمە بارانێك باری، لە رۆژهەڵاتیشەوە ئاسمان چەخماخەی ئەدا.

ریچ لە سەعات شەش و بیست دەقیقەی رۆژی ٢٨ی نیسان کفری بەجێهێشت و رووی کردە ناو (بەیات) لەوێوە چوو بۆ (دوز) و بەرەو سلێمانی کەوتەڕێ. وەرگێڕە عەرەبیەکەی ئەم کتێبە —بهاءالدین نوری- وێنەی شاری کفری لە کتێبەکەی جێمس بکنغهامەوە وەرگرتووە و لەم کتێبەدا بڵاوی کردووەتەوە.

٤- گەشتەکەی مونشی بەغدادی[٣٤] : مونشی بەغدادی لە گەشتەکەیدا لەگەڵ (ریچ) ئەمیش دەربارەی (کفری) ئەمەی یادداشت کردووە: (کفری شارێکی ئاو و هەوا خۆشە، لایەکی ریزە شاخێکە و لەچاوگەکانیەوە ئاوێکی خۆش دێتە ناو شارەوە، کفری نزیکەی دوو سەد ماڵێکە و باخ و بێستانی زۆری تیادایە و کاڵەکی بەتام و پەسەندی هەیە، دانیشتووانی بەکوردی و تورکی گفتوگۆ ئەکەن، بەشێکیان سوننی مەزهەب و هەندێکیان علي الله هین، لە دەرەوەی شار ئاورێژێکی گەورە هەیە و باراناوی پیادا دێت، لەسەردەمی کۆندا شوێن ئەم ئاوڕێژە خانوو بووە ئێستاکە هەموو بوونەتە کەلاوە، بێڵێکمان هێنا و چاڵێکمان بەدرێژایی و پانی دەگەز و بەقولایی دەگەز هەڵکەند، چەند دیوارێکمان بۆ دەرکەوت لەسەر بەردەکانی نیگاری رەنگاورەنگی تیا هەڵکەندرابوو بۆمان دەرنەکەوت ئەم بەردانە هی چی دەورێکن، بەفەرسەخێك لەولای کفریەوە شاخێك هەیە هەشت ئەشکەوتی

ـێـدایە ناو ئەشکەوتەکانمان هەڵکەند، لەهەر ئەشکەوتێکیاندا سێ گۆڕی لەبەرد ههڵکەندراوی تیادابوو، میلێك لەوە بەولاوە کەلاوەی قەڵایەکمان لەسەر شاخێك ـیـنی. نەمان ئەزانی چۆن دانیشتووانی ئەو قەڵایە ئاویان لەفەرسەخە ڕێگەیەکەوە بۆ ئەهات.

ئەسکی کفریش لە کفریەوە فەرسەخە ڕێیەك دوورە، درێژی گردەکە چوارسەد پێ و پانیەکەشی سێ سەد پێیە و بەرزاییەکەشی پەنجا پێیە، لە زەمانی کۆندا ئەم گردە شار بووە، لە دیوارێك بەولاوە کە درێژاییەکەی پەنجا گەز ئەبێت هیچ شوێنەوارێکی دیکەمان تیانەبینی، چەند خشتە کۆنێکمان چاوپێکەوت شتیان لەسەر نووسرابوو، دووری نێوان (قەرەتەپە) و (کفری) حەوت فەرسەخە و نێوان (کفری) و (دوز)یش هەر (حەوت فەرسەخە)[٣٥].

## هۆی دروست بوونی شاری کفری چی بووە؟

هۆی دروست بوونی هەر شارێك ئەگەڕێتەوە سەر ئەم خاڵانە:-

١- بوونی زەوی بۆ کشتوکاڵ و سەرچاوە بۆ ئاودانی ئەو خاکە.

٢- مەرکەزی بەڕێوەبەرایەتی.

٣- شوێنەکەی چەقی یەك دوو ڕێگەیەك بێت.

٤- هۆی ئایینی وەك ئەوەی مەرکەزێکی ئایینی ناسراو بووبێت.

٥- شوێنی جوغرافی، وەك ئەوەی شارەکە کەوتبێتە نێوان دوو هەرێمی لەیەك جیاواز لە شێوە و بەرهەمدا[٣٦].

لەسەرەتادا هۆی دروست بوونی شارۆچکەی کفری وەك (بکنغهام) دەری بڕیوە لەم شوێنەدا وەك ئێستگەیەك بووە بۆ ئاڵ و گۆڕ کردنی پۆستە لەسەر خەتی نێوان بەغداد و ئەستەموڵ و بەسەر کەرکوکدا، ئەم شارۆچکەیە ساڵ لەدوای ساڵ چەسپاوە و پێی گرتووە و گەوردبووە و کە ڕێگەی بازرگانی سلێمانی و بەغدادیشی کەوتووەتە سەر ئەوەندەی دیکە گەز گەز باڵای کردووە و

بوژاوەتەوەو پەل و پۆی کوتاوە گەورە و فراوانەوە بووە، جگە لەوەش شارەکە کەوتوەتە نێوان دوو هەرێمی لەیەك جیاواز لە شێوە و بەرهەمدا سروشتی رۆژهەڵاتی ریزە شاخ و رۆژئاواشی پێ دەشتێکی کرکای کرکە، کفری بەپێی ئەم شوێنە جوغرافیەی بووەتە کلیلی دەرگای هەردوو هەرێمە لێك جیاوازەکە واتە (هەرێمی چیا و هەرێمی دەشتایی)، ئەمەش وای کردووە داگیرکەر و جەنگاوەران لە یەکێکیان بۆ بێتە خوارەوە و پەلاماری بدەن و داگیری بکەن با بۆ ماوەیەکیش بووبێت.

لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەوە هۆزی (دەلۆ) لە ئاواییەکانی رۆژهەڵات و رۆژئاوای کفری نیشتەجێ بوون، هۆزی (زەنگەنە)ش لە ئاواییەکانی بەشی باشوور و رۆژهەڵاتی باشوور نیشتەجێ بوون، هۆزی (جاف)یش لەولای سەرقەڵاوە[٣٧] تا سەر سنووری ئێران کشاون، هۆزی (بەیات)یش لە دووری چل کیلۆمەترەیەك لە ژووری کفریەوە تا دوزخورماتو نیشتەجێ بوون و بەدووری چل پەنجا کیلۆمەترەیەك لە رۆژئاوای کفری بەولاوە هەندێ هۆزی عەرەب نیشتەجێ بوون وەك (لهێب، جبور، کەرەوی)، هەر لە مێژەوە لە ئاواییەکانی دەورووپشتی کفریەوە جوتیارانی کورد کۆچیان کردوەتە کفری و تیادا نیشتەجێ بوون و بوون بەهۆی گەورە و فراوان بوونی شارەکە و هەندێ لەو کوردانە زمانی رەسمی حکومەتی ئەو سەردەمە فێربوون -کە زمانی تورکی بووە و هەندێکیشیان چەندە لە شار ماونەتەوە هەر پارێزگاری زمانی مادەرزادی خۆیان کردووە.

لە سەدەی نۆزدەهەمەوە لەناو کفریدا ئەم سێ بنەماڵە ناوبانگیان دەرکردووە:

١- بنەماڵەی (بابان): لەوساوە (برایم پاشای بابان) لە ١١٩٩ی کۆچی بەرانبەر ١٧٨٤ی زایینی بناغەی شاری (سلێمانی) دامەزراند، میرنشینی (بەبە - بابان) بەهەر چوارلادا کشایەوە و پەلی کوتا، لە ساڵی ١٨١٢ هێزی میرنشینی بابان کفری گرت و لەنێوان سوپای بابان و سوپای عوسمانی لەم ناوچەیە شەڕێکی قورس روویدا لەو

شەڕەدا سوپای بابان شکستی هێنا هۆی شکست هێنانەکەشی ئەگەڕێتەوە سەر دووبەرەکی نێوان بنەماڵەی بابان هەر ئەمەش بوو بەهۆی سەرەکی بۆ هەرەس پێهێنانی خودی میرنشینەکە، دوا میری بابان (ئەحمەد پاشا) لە ساڵی ١٨٥١دا دەستگیری تورکەکان بوو رەوانەی ئەستەموڵ کرا، پاش روخاندنی ئەو میرنشینە (قادر پاشا) چووە کفری و لەوێ چەند دۆنمە زەویەکی فراوانی لە دەوڵەت ئیلتزام کرد و ئیسماعیل بەگی براشی لەگەڵیا چوو لەناو شاری کفری چەند خانوو بەرەیەکی دروست کرد لەوساوە تا ئێستا گەڕەکێك لەدوو گەڕەکەکانی کفری بەناو ئەو (ئیسماعیل بەگ)ەوە ماوەتەوە.




بەناوبانگترین میری بابان لە کفریدا (مەجید پاشای کوڕی قادر پاشا)یە لە ساڵانی ١٣١٢ — ١٣١٤ لە رەواندز و کۆیە و شامیە قایمقامی کردووە، پاش مردنی باوکی لە کفری نیشتەجێ بووە، مەجید پاشا لە کفریدا کۆشك و تەلارێکی گەورەی دوو نهۆمی بۆ خۆی دروست کردووە[٣٨]، هەروەها کاروانسەرایەکی زۆر گەورەی لە پایین شارەوە لەسەر رێگەی سلێمانی دروست کردووە[٣٩] و لەسەر ئەرزێکی پەنجا دۆنمی باخێکی فراوانی چاندووە کە بەباخی پاشا ناوبانگی

دەرکردووە[٤٠]، مەجید پاشا نەبەردێکی چاوتێربووە هەمیشە ئەدیب و شاعیرانی لەدەور کۆبووەتەوە، شێخ رەزای تاڵەبانی (١٨٣٥ – ١٩١٠) چەند جارێك دیدەنی پاشای کردووە و بەم جۆرە ستایشی کردووە کە ئەڵێت:

| | |
|---|---|
| شخص کامل ئەگەر بۆلسە بووگون | مەرحەمەتلو (مەجید پاشا)در |
| دودمـــــان ملـــــوك بـابـــانن | قالمە برشەمسی عالـەم ئارادر |

واتە ((ئەگەر ناودارێکی تەواو لەم سەردەمە ما بێتەوە ئەویش مەجید پاشای خاوەن سۆز و بەزەییە، لە پاشماوەی بنەماڵەی بابانە، ئەو وەك هەتاوێکی جیهان رووناك گەر وەهایە)). لە مانگی رەمەزاناندا پاشا هەموو ئێوارەیەك دەیەها کەسی دەعوەت ئەکرد پێکەوە بەربانگیان ئەکرد و نوێژی تەراویحیان نەکردایە بڵاوەیان لێ نەئەکرد بۆ ئەم رۆژە پیرۆزەش مەلایەکی تایبەتی هەبوو، زەوی و زاری بابانەکان لەسەردەمی مەجید پاشادا یەکجار پەرەی سەند تا ئەم دێهاتانەی کەوتە ناو سنوور (کنگربان، قورِی، چای، عەرجان، زەنگلو، حلێوە، ساری گۆل، سەیدەلان، حاجیلەر) جگە لەوەی لەناو کفریدا دەیەها دوکان و خانووبەرەیان دروست کرد، مەجید پاشا لە ساڵی ١٩٠٩دا لە بەغداد کۆچی دوایی کرد و لە گۆڕستانی ئیمام ئەبو حەنیفە لە ئەعظمیە بە خاك سپێردرا.

پاش مەجید پاشا جەمیل بەگی کوڕی بەماڵەوە چووە (کنگربان) و توانی ئەو داراییەی لە باوکی بۆ مابووەوە بیانپارێزێ، جەمیل بەگ یەك دووجار نوێنەری کفری بووە لە مجلیسی نیابیدا لە خۆیدا پیاوێکی دڵ نەرمی بێ لایەن بووە، دوو ژنی هێناوە یەکێکیان (شەمسە خان) لە بەگزادەکانی جافە و سێ کوڕی لێ بووە (محمد، ئەحمەد، مەحمود) دووەمیان (عائشە خان) لەهۆزی بەیاتە و دیسانەوە سێ کوڕی لێ بووە (نەجیب و ئیسماعیل و فاتح)، لەناو ئەم کوڕانەدا ئەحمەدیان (نابینا) بووە، بەڵام زاکیرەیەکی بەهێزی بووە و ئەندام بووە لە

کۆمەڵی (هیوا) و ئاهەنگی نەورۆزی لە کفریدا کردووە و یارمەتی هەژار و رۆشنبیرانی داوە، جەمیل بەگ ساڵی ١٩٤٦ لە بەغداد کۆچی دوایی کردووە لەسەر وەسیەتی خۆی لە کفری لە باخی پاشا بەخاك سپێراوە ئەحمەدی کوڕیشی لە ساڵی ١٩٧٥دا لە بەغداد کۆچی دوایی کردووە و بەتەنیشت باوکیەوە نێژراوە.

بنەماڵەی (بابان) لەگەڵ هۆزی جاف و سەیدەکانی کفری خزمایەتیان کردووە مەجید پاشا کچی خۆی داوەتە سید حسین ئاغا و جەمیل بەگیش ژنی لە بەگزادەکانی جاف هێناوە.

٣- بنەماڵەی سەیدەکانی کفری (سادات کفری):

هیچ بەڵگەیەکی ئەوتۆمان بەدەستەوە نییە تاوەکو بزانین ئاخۆ باپیرە گەورەی ئەم بنەماڵەیە لە کەیەوە هاتونەتە ئەم شارە، بەمەزندە (سید عومەر ئاغای گەورە) لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا هاتووەتە کفری و لەگەڵ هۆز و بنەماڵەکانی ئەم ناوچەیەدا ژن و ژن خوازیان کردووە و تاوەکو ژمارەیان زۆر بووە و گەڕەکێك لە دوو گەڕەکەکانی شار بەناو (گەڕەکی سەیدەکان)ەوە ناوبانگی دەرکردووە.

وەك لە کتێبی (الشیخ معروف النودهی)دا دەرئەکەوێ سەیدەکانی کفری لەسەرچاوەدا ئەچنەوە سەر (سەید عەلی وەندرینی)[41] کە ئەویش لە سەیدەکانی بەرزنجەیە، لەسەرچاوەیەکی چاپکراودا ئەڵێت: دامەزرێنەری ئەم بنەماڵەیە لە ساڵی ١٨٠٠دا لە گوندی (تلیشان)[42] نیشتەجی بووە، لە ساڵی ١٩١٦دا سەرۆکی ئەم بنەماڵەیە (سید حسین ئاغا) بووە و کچی مەجید پاشای بابانی هێناوە، ئەم بنەماڵەیە زەوی و زارێکی زۆریان وەدەست هێناوە، خۆیان شافعین و بەکرمانجی خواروو گفتوگۆ ئەکەن[43].

پەیوەندی ئەم بنەماڵەیە لەگەڵ شێخانی سلێمانی هەمیشە بەتین بووە کە شێخ سەعیدی حەفید ساڵی ١٩٠٨ لە موصل کوژرا یەکێك لە ئاژاوە گێڕەکان و

لەوانەی مایەفیتنە بوون لە کفریدا خۆی شاردبووەوە شەوێ سەیدەکانی کفری ناردیان لە تۆڵەی شێخدا لە ماڵی خۆیدا بەکوشتنیاندا.

پاش مردنی حسین ئاغا (سید محسن ئاغا) ناوبانگی دەرکرد و خانووبەرە و دیوەخانەیەکی گەورەی دروست کرد[٤٤]. شێخ مەحمودی حەفید لە گەڕانەوەیدا بۆ کوردستان سێ رۆژ لە ماڵ سید محسن ئاغا لەم دیوەخانەیدا پێشوازی خەڵکی کردووە، سید محسن ئاغا پیاوێکی رۆشنبیر بووە چەند ساڵێك سەرۆکی شارەوانی کردووە لە ساڵی ١٩٣٤دا کۆچی دوایی کردووە پاش ئەو (سید عومەر ئاغا)ی ئامۆزای ناوبانگی دەرکردووە و ئەمیش چەند ساڵێك سەرۆکی شارەوانی و خاوەن دیوەخانە بووە، لە ساڵی ١٩٥١ چووەتە ماڵی خوا بۆ حەج کردن لەوێ فەرمانی خوای بەجێهێناوە.

درەختی رەگی سەیدەکانی کفری (سەید ئاغا)




سەیدەکانی کفری هەرچەندە بەژمارە کەم بوون، بەڵام بە قەوارە لەناو شاردا سەنگی تایبەتی خۆیان هەبووە و لەگەڵ هۆز و بنەماڵەکانی (بابان، جاف، زەنگەنە، وەنداوی) ژن و ژن خوازیان کردووە.

- بنەماڵەی (وەنداوی – وەناوی): مێژووی ئەم بنەماڵەیە ئامێتەی مێژووی شاری کفری بووە، هەندێك بیروڕایان وەهایە کە (وەنداوی) لە (وەند)ەوە هاتووە وشەی (وەند)یش ئازا ئەگرێتەوە هەروەها شوێن ئەگرێتەوە وەك دیناروەند، ئەڵێن گوایە ئەم بنەماڵەیە لە دەوروپشتی ڕووباری (وەند)ەوە بڵاوەیان لێ کردووە، هەندێکیش ئەڵێن لە (قەڵا وەناویلە)ی ناو داودەوە هاتوون، بەڵام بەشێکی زۆر لە وەنداویەکان خۆیان ئەڵێن باپیرە هەرە گەورەیان لە شاری (وان)ی[45] کوردستانی تورکیاوە کۆچیان کردووەتە ئەم شارە.

درەختی ڕەگی وەنداوی




کە سوڵتان مورادی چوارەم (١٠١٨ – ١٠٤٩)ی کۆچی سوپایەکی گەورەی بۆ گرتنەوەی (بەغداد) ڕێکخست، لەناو ئەم سوپایە کۆمەڵێك لە دانیشتووانی (وان) بەسەرۆکایەتی (هەڵاو بەگی کوڕی شەرەف بەگ) هەبوون، ئەم هەڵۆ بەگە پیاوێکی بەتەمەن بوو لەلایەن سوڵتانەوە ڕێزی لێ ئەنرا و پێی ئەووت (وانڵی دایی) واتە (خاڵۆ وەنداویەکە) لەم وشەوە ناوی (وەنداوی، وەناوی)یان بەباڵادا بڕا، پاش سەرکەوتنی سوڵتان و لەشکرەکەی لە گرتنەوەی بەغداددا سوڵتان پارچە ئەرزێکی فراوانی لە ناوچەی داودە بە (هەڵاو – هەڵۆ) بەگ بەخشی ئەویش قەڵایەکی تیادا دروست کرد کە بە (قەڵاوە ناویلە) ناوبانگی دەرکرد.

یەکێك لە درەختی رەگی وەنداوی




بۆ ساغ کردنەوەی سەرچاوەی ئەم بنەماڵەیە چەند بەڵگەیەکی دەست خەتم بەرچاو کەوت یەکێکیانم بەهۆی (جەمیل ئەکرەمی کوڕی مستەفا ڕێژییەوە) ڕۆژی ۱۹۷۹/۹/۱۲ بینی کە بریتیە (لە فەرمان، ئیرادە) یەك لە سوڵتان موڕادی چوارەمەوە دەرچووە ئەڵێت ( بە ئەمری سەنیەی سوڵتانی داوەدی کوردستان و قەڵای وەنداوی – قەڵای کوێخا غەفور –مان بەخشی بە هلال) هەر لە هەمان فەرماندا ناوی هەندێ بنەماڵە نووسراوە، وەك (لاکەلی) و (ئۆران قیلی)[٤٦] لە دێڕی خوارەوەی بەڵگەنامە کە ناوی (عبدالقادر بن عمر بن کاظم بن مصطفی بن محمد بن عساف بن هلال) نووسراوە، ڕەنگە (هلال) هەر (هلاو ، هیلاو، هەڵۆ) بووبێت.




هەروەها رۆژی ١٩٨٠/٥/٨ وەسیەتنامەیەکم لای (بەهجەت فەتاح وەنداوی)[٤٧] چاو پێ کەوت کە (ئیبراهیم بەگی وەنداوی) وەسیەتنامەی مولکی خۆی کردووە بۆ (سلێمان)ی کوڕی و (لطیف نور الدین)ی تیا کردووەتە (وەصی)، درێژی وەسیەتنامەکە (٧٥سم) و پانیەکەشی (٢٤سم)ە، لەسەر کاغەزێکی ئەستوور و بەخەتێکی نایاب نووسراوە ئەڵێت (لە ولایەتی بەغداد، لە لیوای شهرزور و ناو شاری صلاحیە – واتە کفری – و لە دانیشتووانی گەڕەکی ئیسماعیل بەگ، ئیبراهیم بەگی کوڕی مەحمود بەگی کوڕی هیلاو بەگ و ژنەکەی کە عەدلە خاتونی کچی ئەحمەدی کچی مەلا موسایە وارثیەتی و کوڕەکەشی کە قاصرە (واتە منداڵە) و ناوی سلێمانە بەڵگەنامەکە ٣١ دێرە و لە ١٧ی مانگی رەجەبی ساڵی ١١١٩ی کۆچیدا

نووسراوە و سی و یەك كەس مۆریان پێوەناوە لەم ناوانە (سەید خەلیل ئاغا و موسا بەگ و ئەمین چەلەبی و مەحمود بەگ) ئەندامانی ئەنجومەنی ئیدارەی شار بوون، ئەم بەلگەنامەیە ئەوەمان پیشان دەدات كە مامۆستا (بەهجەت فەتاح) لەوەچەی ئیبراهیم بەگی وەنداویەوە و ئەچێتەوە سەر (هیلاو بەگ).

درەختی رەگی وەنداوی (ئەفەندی)




**بەراوردێك لە نێوان ئەم سێ بنەماڵەیە:**

(بابان) و (سەیدەكان) و (وەنداوی) سێ بنەماڵەی سەرەكی شاری كفری بوون (بابان)ەكان بە ژمارەكەم و بەدەسەلات بەهێز و لە چینی ئەرستوقراطی و میرزادە بوون، لە فەرمانبەری میریدا كار بەدەستی گەورەیان تیادا هەلكەوتووە و چەند كەسێكیان لێ گەیشتووەتە پلەی وەزیری[٤٨]، ئەوەندە لەگەڵ چینی رەش و رووتی شارەكە تێكەلاویان نەبووە، (سەیدەكان) بە ژمارە كەم و لە پلەی میریدا لە سەرۆكی شارەوانی بەرەو ژوور نەڕۆیشتوون، تێكەلاویان لەگەڵ چینی رەش و رووتی ناو شاردا هەبوو لە شین و شایی خەلكدا بەشداریان كردووە، لە سەرێكی ترەوە چ بابانەكان و چ سەیدەكان بێ ئەوەی بنەمایەكی هۆزایەتیەكیان هەبێت و هەندێكیان

ـۆت دەرەبەگێك رەوشتیان نواندووە، (وەنداوی)یەكان بەشێكیان لە چینی سەرەوە و ـەشێكیشیان لە چینی خوارەوە بوون و كار و كاسبی ناو شاریش بوون، هەندێ ـەر بە وەنداویەكان یان هەر لەخودی خۆیان گەیشتوونەتە پایەی ئەندامی پەرلەمان و كورسی وەزارەتیشیان[٤٩] پێكاوە.

گەورەكانی ئەم دوو بنەماڵە حوكم بەدەستە (بابان و وەنداوی) كە لە حوكمی دوابراودا كار بەدەست بوون بە كۆمەڵێك دەست و پێوەند و خزم و كەس و كارى خۆیان بەولاوە بە شارەكە خۆی خزمەتێكی ئەوتۆیان پێشكەش نەكردووە.

شوێنە گرنگەكەی كفری بووەتە هۆی ئەوەی چەندەها خێزان لە سلێمانی و قەرەداغەوە رابكێشێتە خۆی و لەناو خۆیدا بیان حەوێنێتەوە، لە قەرەداغەوە (ئەمین چەلەبی) و (حاجی رەشید)ی برای كە بەبازرگانی كردنەوە خەریك بوون لە ئەنجامدا دەوڵەمەند و بەدەست بوون و ماڵ و دیوەخانەیان هەبوو، هەروەها (مەلا حەسەنی مەردۆخی قەرەداغی)[٥٠]یش لەم شارەدا ناوبانگی مەلایەتی دەركردووە. دیسانەوە لە سلێمانیشەوە دەیەها خێزان هاتوون و لەم شارەدا جێگیر بوون وەك (حەمە رەش و سەعیدی كوڕی، وەستا حەسەنی جلدرو و وەستا صالحی برای، صابر سەراج، وەستا محمدی چەخماخساز) جگە لە قەرەداغ و سلێمانی لە كەركوك و موصڵیشەوە[٥١] خەڵك روویان كردووەتە ئەم شارە.

## كاروباری كۆمەڵایەتی و ئابووری كفری:

هەر كاروانێك بە بار و بارخانەی قورس و كوتاڵی ئاڵ و واڵاوە و بەباری خورما و تووتن و پێستە و خواردەمەنی وشكەوە كراوەوە بەرەو ژوور و بەرەو خوار برۆیشتایە ئەوا شەوێك دوان لە كفریدا باریان ئەخست و تێكەڵ بەدانیشتوانی كفری ئەبوون لەرێ و بانددا وڵاخەكانی ناو كاروان یەك لە دوای یەك ئەرۆیشتن. سوار لەگەڵ سواردا تەراتێنی نەئەكرد، یاساوڵەكان دابەش ئەبوونە ناو كاروانەكە، رێ كردن هەر بەرۆژ بوو، رۆژی هەشت نۆ سەعات ئەرۆیشتن، ئێوارێ دائەهات لە

قۆناغـدا باریـان ئەخـست و دان و ئالیکیـان بـە وڵاغـەکانیان ئـەدا و خۆشـیان ئەحەسانەوە، لە رۆژێکدا کاروان پـەنجا شەست کیلۆمـەترە رێـی ئـەبڕی، زەنگوڵەی ملی وڵاغی کاروانەکان لە سەعاتە رێیەکەوەئاگاداری ئەهلی شاری ئـەکرد، لـە شیرەی شەفەقدا کاتێ ئـەو کاروانـە ئەکەوتـەوە رێگە دیـسانەوە لـەرەی ئـەو زەنگوڵانـە بـێ دەنگی و کپـی بەرەبـەیانی شـەق ئـەکرد، کـاروان تـا کـاروان فـەرقی هـەبوو، کـاروان واهەبوو بریتی بوو لە سـەد وڵاغێـك کـاروانی واش هـەبوو چـل پـەنجا وڵاغێـك بـوو، قەتارچی واهەبوو وڵاغی هەموو ئەو کاروانە کە هی خۆی بـوو لەگـەڵ یاساوڵەکان و خزمـەتگوزاران کـرێ گرتـەی ئـەوبوون، قەتارچـی بـاج و سـەرانەی بـەو خانـچی و سەرەك هۆزانە ئەدا کە کاروانەکە پیادا تێ ئەپەڕی، فەرمانبەر، قوتابی، گەڕیـدە لـە شارێکەوە بۆ شارێکی تر تێکەڵ بەکاروان ئەبوون، لەو سەردەمەدا لە شـاری (کفـری) حـەوت خـان[٥٢] (کاروانـسەرا) هـەبوو، لەهـەر یەکێکیانـدا چـەند ژوور و بـەردەڵان و حەوشەیەکی گەورە هەبوو، بەزسـتانان زەلام شـەو لـە ژوورەوە و وڵاغەکانیـشیان لـە تەویلەکانـدا تـەقات ئـەکران، کاروانـچی و ئامـشۆگەران و بازرگانـەکانی نـاو کـاروان ئێـوارێ ئەچـوونە نـاو شـار شـت و مـەکی خۆیـان ئـەکڕی و ئەگەڕانـەوە نـاو کاروانـسەراکەیان، لـە سـەرما و سۆڵە و شەسـتە بـاران و رۆژانـی شـەڕ و شـۆڕدا ئـەو کاروانە چەند رۆژێك لە یەك شوێندا گیریان ئەخوارد.

لە ساڵی ١٨٥٠ لە کفریـدا قەیـسەریەکی گـەورە دروسـت کـرا نزیکـەی سـەد و پەنجا دوکانی تیادا بوو، ئێستاش ئەو قەیـسەریە کۆنـە وەك خـۆی بـەپێوە وەستاوە، ئەوسا ئەو قەیـسەریە پـڕ بـوو لـە دوکـانی بازرگـان و وردەواڵا فـرۆش و جـل دروو و سەراج و کەوش دروو و مزگەر و هـەلاج و پـالان دروو جگـە لـە چـەند چێـشتخانە و قاوەخانەیەك لەناو کۆڵانەکانی نزیـك بـە بـازاڕ چـەند ناڵبەنـد و بۆیەخانـە و جـۆڵا هەبوون، چەند ماڵێـك لـە کفـری بـە سابوون دروسـت کـردن ناوبانگیـان دەرکردبـوو ئێستاش شوێنەواری ئـەو ناوەیـان پێـوە ماوەتـەوە، دوو گـەرماوی نایـاب لـەناو شـاردا هەبوون.

یەکێك لە نیشانەی بوژاندنەوەی شاری کفری ئەوەبوو هەژدە ئاسیاوی[٥٣] ...بوو کە بەتەوژمی ئاو ئەگەڕان، هەر ئاسیاوێك ڕۆژێ نزیکەی بیست وەزنە گەنمی ئەهاڕی، سێ کەس بە نۆرە لەهەر ئاسیاوێکدا کاریان ئەکرد، ئاسیاوی جونەکەکان نەبێت لەناو شاردا بوو ئەو دوایی لەملاو لەولای شار و لەناو چەمەکەدا ...بەش بووبوون، زۆربەی ئاسیاوەکان منارەیەکی تیادابوو، ئەگەر ئاسیاو باراشی ...تایە کەمی ئەوا بانگەوازی (ئاش بەتاڵ) لەسەر منارەکەوە بەرز ئەبووەوە، جگە ...ەوەی منارەکە پارێزگا و سەنگەرێك بوو بۆ ئاش و ئاشەوان و باراش هاڕ.

لەناو کفریدا چەند دیوەخانەیەك هەبوو، عەسران و شەوان پیاو ماقوڵان و ڕۆشنبیرانی شار ئەچوونە دیوەخانە یەك دوو سەعات دائەنیشتن و گفتوگۆیان ...دربارەی دەنگوباس و ڕووداوەکانی ئەو حەلە ئەکرد و لەوێ هەریەکە یەك دوو قاوەی تاڵیان ئەخوارد و ئەگەڕانەوە، دیوەخانەی سەیدەکان لە هەموو دیوەخانەکانی تر گەرمتر بوو، میوان و گەڕیدە و ئاوەرەکانیش ڕوویان تێ ئەکردن و چەند ڕۆژێك تیا ئەحەسانەوە.

دەوروپشتی شاری کفری بەباخ و بێستان ئابڵوقە درابوو لە دوورەوە کە ڕووت بکردایەتە شار لەبەر چڕی دار و درەخت خانووی شارەکە بە ئاستەم سەربانیان دەرئەکەوت، باخی گەورەی ئەوتۆ هەبوون ڕووبەری هەریەکێکیان پانزدە بیست دۆنمە زەوی گرتبوو[٥٤]، جگە لەوانە باخی بچکۆلەتر هەبوو کە (باخچە)یان[٥٥] پێ ئەوتن ڕووبەری هەریەکێکیان لە نێوان پێنج تا دە دۆنمە زەوی گرتبوو، لەناو ئەو باخانەدا دارە خورما و دار پرتەقاڵ و لیمۆ و نارنج و هەنار و ترێ و هەڵوژە هەبوون و لە سێبەری ئەو دارانەشدا دالێ و سەوزە ئەچێنرا، هەر باخێك چەند باخەوانێکی هەبوو، سەرجەم نزیکەی سەد کەسێك زیاتر ژیانیان لەسەر باخەوانی بوو.

لەدێی (ناصالح) کە بەدە دوانزدە کیلۆمەترەیەك ئەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی باشووری کفریەوە کانێکی خەڵوزی بەرد هەبوو کە بە.(قیرەکە) ناوبانگی

دەرکردبـوو، عوسمانلیـەکان لـە سـەردەمێکدا سـاڵێ نزیکـەی (١٥٠) تـەن قیریـان لـێ دەرئەهێنا، لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهان بەهۆی ئەڵمانەکانـەوە ساڵێ نزیکـەی هەزار تەن قیرِی لێ دەرئەهێنرا و رەوانەی (سامەڕا) ئـەکرا لـەوێوە بەشـەمەندەفەر ئەنێردرا بۆ دەرەوە، تا چلەکانیش سوود لەم کانە قیرە وەرئەگیرا و دەیـەها خێزانـی بەرێوە ئەبرد، لە پەنجاکانەوە کە نەوتێکی زۆر لەوڵات دەرهێنرا ئیتر ئەو کانە قـیرە پشت گوێ خرا تا باراناو چاڵەکانیشی کوێر کردەوە.

لـە وڵاتـە یـەکگرتووەکانی ئەمـەریکادا لـە هـەموو وڵاتـەکان زۆرتـر قـیر دەرئەهێنرێت پاش ئەو (ئوسترالیا و سۆڤیەت و بەریتانیا و پۆڵەندە)یە لـە پۆڵەنـدە ساڵی ١٩٨٢ رادەی دەرهێنانی قیر لە ١٥,٩٪ ساڵی پێشووتر بـوو، بەرادەیـەك قـەوارەی گەیـشتە (١٨٩) ملیـۆن تـەن لـە ٥٦٪ی ئـەم قەوارەیـەی رەوانـەی بازاڕەکـانی دەرەوە ئەکرێت.

نەوت لە زۆرانبازیدا گرەوی لە قیر بردووەتەوە، بەڵام نـەوت کەرەسـتەیەکە وشك ئەکات کەچی قیر رەگی دوور و درێژە و وەك یەدەك پاڵ پشتێکە بـۆ نـەوت و سامانێکی نەتەوەییە و شایانی ئەوەیە لایەکی لێ بکرێتەوە.

**باری رۆشنبیری کفری:**

(حاجی کاك ئەحمەدی شێخ ١٢٠٧ — ١٣٠٥ی کۆچی) لـەدوا سـاڵەکانی سـەدەی رابـووردودا لـە کفرییـەوە بـەرەو بەغـداد ئەچـێت زۆر رێـزی لـێ ئـەنرێت و چـەند رۆژێك تیا ئەمێنێتەوە، ئەمر ئەکات مزگەوت و مەدرەسەیەك بۆ دەرسی ئـایینی لـە کفریدا بکرێتەوە لەو سەرەوە کە لە حـەج ئەگەڕێتـەوە مزگـەوت و مـەدرەسـەکە کـە پێکەوە تەواو ئەبێت بەمـە زۆر دڵخۆش ئـەبێت و رەزامەنـدی لـە دانیـشتووانی شار پیشان ئـەدات، ئێـستاش ئـەو مزگەوتـە لـە شـوێنەکەی خۆیـدا پـارێزراوە و فـراوان و گەورەتر کراوە و هەر بە (مەدرەسە) بەناوبانگە.

ر شێخ عومەری کوڕی شێخ عوسمانی نەقشبەندی - شێخی ضیاء الدین ١٢٥٥-
ـە کفریـەوە تـێ ئەوپـەڕی ئـەمیش فـەرمان ئـەدات خانەقایـەك نزیـك بـە
ـ ـ ـە) دروست بکرێ، مەجید پاشای بابان کتوپڕ ئەرزێکی ئەبێت ئەیبەخشێت
ـ ـوی دانیشتووانی شار خانەقاکە و خانوویەك بۆ مەلا لە ساڵی ١٣٠٧ای کۆچیدا
ـ ـت ئەکرێت، لە گەڕانەوەدا شێخی ضیاءالدین بەمـە زۆر دڵخۆش ئـەبێت (مـەلا
ـحمەد)ی[٥٦] موریـد و مەنـسوبی خـۆی ئەکاتـە مـەلای خانـەقا و لـەوێ بـەجێی
ـخـێت. هەروەها (شێخ نظام الدین) کوڕی شێخی ضیاء الـدین ماوەیـەك لـە کفـری
ـ ـتەوە و کچی مفتی (ئیسماعیل) ئەفەندی[٥٧] مـارە ئـەکات و ئـەیهێنێت، بەمـە
ـوەندی نێوان شێخانی نەقشبەندی[٥٨] و دانیشتووانی کفری پتەوتر ئەبێت.

لـە سـاڵی ١٣١٢یـشدا بـە ئـەمری سـوڵتانی عوسمـانی مزگـەوتێکی گـەورە لـە
ـریدا دروست ئـەکرێ کـە بـە (مزگـەوتی گـەورە) بەناوبانگـە، پاش کۆچـی دوایـی
ـتی (مەلا ئیسماعیل) مەلا مستەفا ئەبێتە ئیمام و خەتیب پاش ئەو (مەلا سەعید
ـویلی)[٥٩] ئەبێتە مفتی و ئیمام لەم مزگەوتەدا.

لـەم سـێ مزگەوتـەدا دەیـەها سـوختە و فـەقێ دەرسـیان خوێنـدووە و
ـەیوەندیان لەگەڵ دانیشتووانی شاردا پەیدا کردووە و ئیدارەیان لە سەریان بـووە و
ـزیان گیراوە و دەوریان دراوە. لـەو سـەردەمانەدا لـە کفـری قوتابخانەیـەکی
ـەرەتایی (صبیان مکتبی) و قوتابخانەیەکی ناوەندی (روشدیە) هەبووە، لە هـەردوو
قوتابخانەکـەدا نزیکـەی سـەد و پـەنجا قوتـابی هـەبووە، هەنـدێك لـە دەرچـووانی
روشدیەی کفری لە بەغداد و ئەستەموڵ خوێندنیان تەواو کردووە[٦٠].

رۆژ نـەبوو کـاروان لـە کفریـدا بـار نـەخات و بـار نـەکات، گەڕیـدە و زانـا و
بازرگـان و قوتابیـان و رێبـوارانی تـری نـاو ئـەو قـەتار و کاروانانـە لـە چاخانە و
دیوەخانە و دوکانەکانی کفریدا تێکەڵ بە ئەهلی شار ئـەبوون و پەیوەنـدیان لەگـەڵ
ئەبەستن، هەر روداوێك لەسەر خەتی (قەوقاس – تەورێز – سلێمانی – بەغـداد –
بەسرە) و لـەوان دوورتـریش رووی بدایـە ئـەوا لـەناو خـان و بـازاڕ و دیوەخانـەکانی

کفریدا دەنگی ئەدایەوە، سەدەها زانا و هونەرمەند تیادا تێپەڕیان کردووە و دلگیری دیمەنی ئەم شارە بوون یەکێك لەوانە شاعیرێکی ئەزربایجانیە کە بە (نەسیمی) ناوبانگی دەرکردبوو لەگەڵ (مرادۆف)ی هونەرمەندی هەڤاڵیدا بەکفریدا تێ ئەپەڕن، ئاو و هەوای شار و لوتکەی بەرزی باوەشاسوار و بزەی ئەو ئافرەتانەی کە لەو شەرعاو جۆگەلەیەوە بە جەرە ئاو هەڵئەگرن دڵیان دەلەرزێنێت و پارچە شیعرێکی ئازەری بەناونیشانی (کفری گوزەلی — واتە — جوانی کفری)یەوە ئەهونێتەوە و مرادۆفیش ئاوازی بۆ دائەنێت[٦١]، ئەو گۆرانیە نیشانەیەکی ترە بۆ پەیوندی نێوان کفری و شارەکانی هەرە دووری ئەو حەلە.

لە سەدەی پێشوەوە لە کفریدا چەند شاعیرێك ناوبانگیان دەرکردووە، وەك (مەلا مستەفا)ی[٦٢] مفتی و خەتیبی کفری کە شیعرەکانی زۆربەی بابەتی ئاینین و بەزمانی تورکی هونیویەتەوە، پاش ئەو دوو (خلیل) ناوە لە کفری و دەورویشتیدا ناو بانگیان دەرکردووە، (یەکەمیان) مەلا خەلیلی داودیە کە بە --عەبدال[٦٣]- بەناوبانگە (دووەمیان) خەلیل منەودەرە[٦٤]. ئەم شاعیرە لە هۆزی (کاکەیی)یەو نزیکەی چارەکە سەدەیەك لە کفری ماوەتەوە، پارچە شیعرەکانی باری کۆمەلایەتی و رۆشنبیری و ئابوری ئەو حەڵەمان بۆ ئەخاتە روو ئەڵێت:

نیزاع عشرەت جملە جهـــــانەن　　تـــــایفە الملوك رۆم و ئێـــــرانەن

شێخ بێ کەرامەت (موللا) موقلاجی　　دەروێش کەم زیکرەن وە نـــاعیلاجی

هامساوە هامسامە کۆ خەیـــانەت　　نەمەندەن ئەرکان ئەمن و ئەمـــانەت

لە گشت ئیقلیمێ هەر فەتارەتـــەن　　هەر حەرب و زەربەن قەتڵ و غارەتەن

یان باسی زوڵم و زۆری ئەو حەلەی دەوڵەتی عوسمانلیمان بۆ ئەگێرێتەوەو ئەڵێت:

جارێ (سەرانە) جارێ (کەرانە):

جارێ (رەشبگیر) زوڵم زەمانە

جارێ (شەخصیە) جارێ (ئەصناف)

عوسمانلیلرن بودر اصنافی؟

ـ ته (ئەمەیە اصناقی عوسمانلیەکان کە ئەوەندە خەرج و باجیان خستوەتە
ـــ ـ خەلکەوە؟)، بەمەشەوە ناوەستێت ئەڵێت:

ـدوری عوسمانلی ئوچیوز ئۆن ئوچەن:

بیّ پارە و موفلیس هەم مایە پووچەن

ـ ـەم ساڵە کە ساڵی ١٣١٣یە بەرامبەر ١٨٩٥ی زایینی ئەکات عوسمانلی بیّ پارە و ـــ پووچ لیی دانیشتووە). کە شێخ سەعیدی حەفید لە موسڵ کوژرا شاعیر ـــ ـنێکی گرنگ کارەساتەکەی لە رەگ و ریشەوە شی کردەوە.

شاعیر کارێکی گەورەی کردبووە سەر دانیشتووان جارێکیان (قۆجە شاوڵی) ـ ـکە ئەکرێتە ئەندامی شارەوانی، شاعیر ئەمەی پیّ ناخۆش ئەبێت، نارِەزایی ـ ـدرئەبڕێ و ئەڵێت:

ئەوساکەم زانی کفری کاولە:

ئاغای مەجلیسمان قۆجە شاوڵە

شار بەمە دێتە جۆش و خرۆشەوە و ئەچنە سەر قایمقام ئەویش ئەو ـ ـدودیە هەڵئەوەشێنێتەوە.

لە دیوەخانی چەند کەسێکی وەك (مەجید پاشا و سید محسن ئاغا و ـــارەك ئەفەنـدی) گەلیّ کتێب هەبوو هەروەها خانەقا و مەدرەسە و ـرگەوتەکانیش پڕ بوون لە کتێب. ساڵی ١٩٠٨ کە جاڕی مشروتیەت درا لقی (ئیتحاد ـ تەرەقی) لە کفریش دامەزرا و چەند فەرمانبەرێکی عوسمانلی و چەند کەسێکی ـ ـیشتووانی شار ئەندام بوون لەو کۆمەڵەدا[٦٥].

شارێکی وەك (کفری) کە ئەم مێژووە دوور و درێژەی هەبووبێت و ـرودۆخێکی گرنگی بەخۆیەوە بینیبێت هیچ مایەی سەر سوڕان نییە کە زوڵم و ـۆری عوسمانلی و بەریتانیای داگیرکەر قبوڵ نەکات و باوەش بۆ شۆڕشگێڕان ـەکاتەوە، هەر ئەم شارە بوو کە بووە زەمینەیەکی چەسپاو بۆ ئەو شۆڕشە و ئەرکی ـۆڕشەکەی گرتە ئەستۆ و سەری لە ئاستی داگیرکەران دانەنواند.

## پەراوێزەکانی بەشی دووەم:

١- بڕوانە: کتێبی (هاواری لاوان)، نەریمان، چاپی ١٩٥٣ ل٦٢.

٢- بڕوانە: رۆژنامەی (التآخي) رۆژی ١٩٦٧/٣/٨ نووسینی (علاء محمد علی الشيخ حسن).

٣- بڕوانە: (التآخي) رۆژی ١٩٦٧/١٠/٢٤ نووسینێك بەناونیشانی (شمال العراق في تأريخه القديم) نووسینی (د. سامي سعيد الأحمد).

٤- (مێژووی کورد و کوردستان) چاپی دووەم، ساڵی ١٩٦١.

٥- شوێنی ئەو جۆگە ئاوە بەبەرفراوانی و چاڵیەوە وشك و برین ماوەتەوە بەڵام شوێنەواری تا بڕوا هەر بەردەڵانە، لە هەشتاکانەوە بیری ئیرتوازی لە بەشی رۆژهەڵاتی لێدراوە و بەچەند گەزێك گەیشتووەتە ئاو.

٦- لە چەند لایەکی ئەو رووبارەدا چەند بەردێکی زۆر گەورەی دروستکراو کەوتووە بۆئەوەی شایەتی بدەن کە لە شوێنەواری ئاوبەستەکەوە ماونەتەوە، لەلایەکدا وەك سێ کوچکانە سێ بەردی دروستکراوی گەورە وەستاون لەچەند لایەکی تردا تاك و تەراك بەپێوە وەستاون.

٧- بڕوانە: جوغرافیای عوسمانی، چاپی ساڵی ١٣٢٩ی رۆمی، لاپەڕە (٢٧٤).

٨- ساڵنامەی عوسمانی: دەوڵەتی عوسمانی لەدوا پەنجا ساڵەی حوکمڕانیدا ساڵانە بۆ هەر ولایەتێك ساڵنامەیەکی لە قەوارەی کتێبێکی (٥٠٠ — ٦٠٠) لاپەڕەدا چاپ کردووە، لەو ساڵنامەدا ناوی شار و شارۆچکە و دێهاتە گەورەکان نووسراوە، باری ئابووری و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری ولایەتەکە دەرخراوە، ناوی کاربەدەستانی تیادایە، وەك پڕۆژەیەك بەدەستمەوەیە چەند ساڵنامەیەك کە پەیوەندی بەخۆمانەوە هەبێت لە تورکیەوە بیانکەمە عەرەبی.

٩- مفتی ئیسماعیل ئەفەندی کوڕی مەحمود زانایەکی بەناوبانگ بووە، شێخی (ضياءالدين) کچی ئەم زاتەی بۆ (نظام الدين)ی کوڕی خۆی مارەکردووە،

ئیسماعیل ئەفەندی یەك كوڕی هەبووە ئەویش (مەلا راغب) بووە و ئەویش باوكی خێزانی نووسەری ئەم كتێبەیە.

١٠- موسا بەگ لەبەری (وەنداوی)ە، دوو موسا بەگ هەبووە، موسا بەگی گەورە و موسا بەگی بچووك.

١١- (سید محسن ئاغا) لە سەیدەكانی كفریە بەرەچەڵەك ئەچنەوە سەر سەیدەكانی بەرزنجە، سید محسن ئاغا ساڵی ١٩٢٤ كۆچی دوایی كردووە و دوو كوڕی هەبووە (عەباس ئاغا و عبدالله ئاغا) ئەوانیش هەردووكیان كۆچی دواییان كردووە و كوڕ و كوڕەزایان لێ بووەتەوە.

١٢- (عثمان ئەفەندی) لەبەری (وەنداوی)یەكانە، دیسانەوە دوو (عثمان) ناویان هەبووە.

١٣- بڕوانە: (ساڵنامەی موسڵ) ساڵی ١٣١٠ی كۆچی – ١٣٠٨ی رۆمی. ژمارەی لاپەڕەكانی (٤٢٤)، بەپێی ئەو ساڵنامەیە سەرژمێری ولایەتی موسڵ هەمووی بەهەر سێ لیواكانیەوە (١٩٦٥٢٦) كەس بووە.

١٤- بڕوانە: (قاموس الاعلام) دانانی (شمس الدین سامی) چاپی ساڵی ١٨٩٦، بەرگی چوارەم ساڵی چاپ كردنی ١٣١١ی كۆچی، لاپەڕە (٢٩٦).

١٥- ئەم سەرچاوەیە دەربارەی سەرژمێری شار و دانیشتووانی شارەوە كەوتووەتە هەڵەوە، چونكە سەرژمێر لەوە زۆر زیاترە و شیعە مەزهەبیش لە شاردا زۆر كەمن.

١٦- موجز تاریخ البلدان العراقیة، عبدالرزق الحسنی، چاپی یەكەم ١٩٣٣، ل ١٩١.

١٧- المرشد إلی موطن الآثار والحضارة، الرحلة الرابعة، بغداد – كركوك، سلیمانیة، طەباقر و فؤاد سفر، -طبع ١٩٦٥، ص (٣٨ – ٣٩).

١٨- دە دوازدە ساڵە ئەم كارگە بەردە لەكار كردن وەستاوە و بەردە چیمەنتۆی لێ دەرناهێنن.

١٩- (قەرە ئۆغلان) وتەیەکی تورکیە بریتیە لە (قەرە) واتە رەش (ئۆغلان) واتە کوڕ، ئەگەر بکرێنە کوردی ئەکاتە (کوڕە رەش)، ئەمە تورکەکان وایان ناوناوە پێش ئەوان ناوی (داوڵ خانە) بووە، لە داوڵخانەدا سوپای کوردی بابان و سوپای عوسمانی چەند جارێك شەڕیان کردووە.

٢٠- (قزلر قلعەسی) دیسانەوە وتەیەکی تورکیە، بریتیە لە (قزلر)، واتە کچان (قەلعەسی) قەڵاکەی، کوردیەکەی ئەکاتە (قەڵای کچان)، بوونی شوێنەواری قەڵایەك لەسەر لوتکەی ئەو شاخە مەگەر پەیوەندی بەکچێکی نەبەردەوە هەبێت.

٢١- بڕوانە: گۆڤاری (الأخاء الترکمانیة)، محمد خورشید داقوقی، ژمارە (٥) ساڵی یانزدە ١٩٧١، ل ٦٥ (بەتورکمانی).

٢٢- (یەددی مەغارە) وتەیەکی تورکیە بریتیە لە (یەددی) واتە: حەوت (مەغارە) ئەشکەوت، لە شاخەکانی بەرامبەر کفری ئەو (حەوت مەغارە)یە هەیە.

٢٣- تورکمان بەشێکن لە تورك، لە تورکستانەوە کۆچیان کردووە و هاتوونەتە خۆراسان و لەوناوە بڵاو بوونەتەوە و گەلێك تایەفەی دیکەی وەك (غەز)ی تێکەڵاو بووە و بوون بە تورکمان، لەسەردەمی بویهیەکان ٣٢٤ی کۆچی و سەردەمی سەلجوقیەکان ٤٤٧ی کۆچی تورکمانەکان شەپۆڵ بە شەپۆڵ روویان کردووەتە عیراق، بڕوانە – موجز تأریخ الترکمان في العراق، شاکر صابر الضابط، ١٩٦٠ ل٣٠.

٢٤- کۆچ کردن بریتیە لە جموجۆڵی کۆمەڵە خەڵکێك لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر مێژووی ئادەمیزاد لە سەردەمی پێش مێژوووەوە، بێ راوەستان بە زنجیرەیەك کۆچ کردندا تێ پەڕیوە. عیراق لە مێژە پێشوازی لە شەپۆلی کۆچ کردن کردووە وەك شەپۆلی نەتەوەکانی هیند و ئەوروپی و شەپۆلی سامی و شەپۆلی مەغولیەکان، عیراق وەك هەرێمێك قەوارە ئابوریەکەی

بەرەو پتەو بوون ئەڕوات. مایەی سەرسوڕمان نیە کە لە دێهاتەکانەوە بەرەو هەموو شارەکانمان شەپۆلی کۆچ کردن بەردەوام نەبێت هەروەها لە شارێکەوە بۆ شارێکی تر هەر بەردەوامە، باری ئابووری و کۆمەلاّیەتی ناو شارەکان لادێ نشینەکان بەرەو خۆی رائەکێشێت. تابە ناسایش بڕین، رژێمی دەرەبەگایەتی پالّ پێوەنەرێك بووە کە جوتیاران بەرەو شارەکان کۆچ بکەن، شارەکانی عیراق بەگشتی و بەغداد بە تایبەتی لە چل سالّ پترەوە بوونە هۆی راکێشانی لادێ نشینەکان. (کفری)یش وەك شارێك لە دامەزراندنیەوە سەدەها خێزانی نەك هەر لە دەوروپشتی خۆیەوە راکێشاوە بەلّکو لە شاری سلێمانی و لە شاری (وان)ی کوردستانی تورکیاشەوە روویان تێ کردووە.

٢٥ بروانە، مێژووی سلێمانی، دانەری محمد ئەمین زەکی، وەرگێڕ، جەمیل رۆژ بەیانی سالّی ١٩٥١، ل ٦٥.

٢٦- دوانزدە ئیمام — دێیەکە بە پانزدە کیلۆمەترە ئەکەوێتە رۆژهەلاّتی کفرییەوە، مەزارگەی دوانزە ئیمامی تیادایە، ئەو شوێنەی شەڕەکەی تیادابووە بە (داولّخانە) بەناوبانگە.

٢٧- (یەنگیجە) تورکیە واتە (تازۆلّکە) گوندێکە لە ناوچەی (بەیات) ئێستا سەر بەناحیەی (سلێمان بەگی) سەر بە قەزای دوزخورماتووە.

٢٨- بڕوانە — کتێبی (رحلة نیبور إلى العراق) وەرگێڕی بۆ عەرەبی (د.محمود حسین ئەمین) چاپی ١٩٦٥.

٢٩- (جێمس بکنغهام) لە ئنگلتەرە لە شاری (فالموت) لە سالّی ١٧٨٦ لە دایك بووە زۆر حەزی لە گەشت و گەڕان کردووە، لە تافی لاوێتیدا چوەتە هندستان، لەوێ رۆژنامەی (کەلکەتە)ی دەرکردووەو تیادا بەرەنگاری لە شەریکەی هندی — رۆژهەلاّتی بەریتانی کردووە، لە هندستان دەرکراوە، سالّی١٨١٢ چووەتە میسر و لە سالّی ١٨١٤ چووەتە فەلەستین و لە سالّی ١٨١٦ گەشتێکی

بەناو سوریا و عیراق و ئێران و هندستاندا کردووە و لە دوو بەرگە کتێبدا گەشتنامەکەی لە چاپداوە، لە ساڵی ١٨٥٥ دا (بکنغهام) کۆچی دوایی کردووە.

٣٠- لە کەرکوکەوە بەرەو بەغدا بۆ ئاڵ و گۆڕکردنی پۆستەی ئەستەمۆڵ ئەم شارۆچکانە دروست کرابوون (داقوق – دوز – کفری – قەرەتەپە – دەللی عەباس – خاڵص) دووری نێوان لە شارۆچکەیەکەوە بۆ ئەویتریان قۆناغێك بوە واتە رۆژە رێگەیەك، سوار لە رۆژێکدا شەست هەفتا کیلۆمەترەی بڕیووە و گەیشتوەتە شارۆچکەی دووەمیان.

٣١- بڕوانە کتێبی (رحلتي إلى العراق) نوسینی (جێمس بکنغهام) وەرگێڕی بۆ عەرەبی (سلیم طه التکریتي) چاپی ١٩٨٦ ژمارەی لاپەڕەکانی (٣٢٤) لاپەڕەیە.

٣٢- مستەر (کلۆدیۆس ریچ ١٧٨٧ – ١٨٢٠) موقیمی بەریتانی لە بەغداد و نوێنەری شرکەتی هندستانی رۆژئاوا بووە لە عیراقدا لە ساڵی ١٨٠٨ وە ئەم پایەی وەرگرتووە و ئاشنایەتی لەگەڵ ناودارەکانی عیراقدا بەستووە، (داود پاشا)ی والی بەغدا لەگەڵ ریچدا ناکۆك بووە بۆ ئەوە کنەی ئەکرد کە لە مافی کەم بکاتەوە و لە دەستی بدات، ریچیش ویستی بەرەنگاری والی بکات بۆی نەچووە سەر، (ریچ) شوێنەوارناس بووە لە (بابل)دا لە گەڵ شوێنی کۆلیوەتەوە و دوو کتێبی لەسەر داناوە. ریچ لەو گەشتەدا بە نەخۆشی کولێرە (چاوەقووڵە) مردووە، خوالێخۆشبوو (بهاءالدین نوري)، گەشتەکەی ریچی وەرگێڕاوەتە سەر عەرەبیو لە ساڵی ١٩٥١دا چاپی کردووە.

٣٣- تەختەڕەوان – ژوورێکی بچکۆلانەیە لە تەختەدار دروستکراوە و شووشەبەندە، بەرەوڕەوە ئەڕوات، ئافرەت سواری ئەبێت و دوو ولاغ رای ئەکێشن.

٣٤- مونشی بەغدادی – سید محمدی کوڕی سید ئەحمەدی حەسەنیە کە بە (محمد ئاغای فارسی) ناسراوە و نازناوی (مونشی بەغدادی) بۆ خۆی داناوە.

مونشی فەرمانبەرێك بووە لە (موقیمیە)ی بەریتانی لە بەغدادا ساڵی ١٨٢٠ لەگەڵ ریچدا تێکەڵ بە گەشتەکەی بووە، هاتووە بە فارسی گەشتەکەی خۆی نوسیووە و لە ساڵی ١٨٢٢ دا لە چاپی داوە، مامۆستا (عەباس عەززاوی) لە ساڵی ١٩٤٨دا کتێبەکەی کردوەتە عەرەبی و لە چاپی داوە.

٣٥- هەر فەرسەخێك نزیکەی دوانزدە کیلۆمەتردیە.

٣٦- بڕوانە: (التوزیع اللغوي والجغرافي في العراق)،د. ابراهیم السامرائي، ١٩٦٨ ل٢٢.

٣٧- (سەر قەلاّ — سەر قەلعە) مەرکەزی ناحیەیەکی سەر بە شاری کفریەو بە بیست کیلۆمەترەیەك کەوتووەتە رۆژهەلاّتیەوە, زۆربەی دانیشتووانی سەر قەلاّ لە هۆزی دەلۆن.

٣٨- ئەم کۆشکە بە کاشی رەنگاو رەنگ و ئاوێنەبەند رازابووەوە, لە ناوەوە سەرداب و فوارە ئاوی تیادا بووە بە جۆرێك مرۆ حەزی ئەکرد تیا دابنیشێت، داخەکەم ئەم کۆشك و تەلارە خرایە پشت گوێ ئێستا لە کەلاوەیەکی نیوە وێرانە زیاتر هیچی لێ نەماوەتەوە.

٣٩- ئەم کاراونسەرایە نزیکەی پەنجا ژووری گەورە و بەردەلاّنێکی پان و بەرینی تیادا بوو وەك خۆی بە پێوە وەستابوو, لە حەفتاکاندا لە بناغە دەرهێنرا و شوێنەکەشی تەخت کرا.

٤٠- گەورەترین باخی کفری بوو، پڕبوو لە دارە خورما و هەنار و مێو و هەڵوژە، لەبەر کەم ئاوی و بێ خزمەتی لە چەند دارخورمایەك بەولاوە هیچی تیا نەماوە و بووەتە دەشتێکی وشك و بەرین.

٤١- بڕوانە کتێبی (الشیخ معروف النودهی)، دانانی (شێخ محمدی خاڵ) ساڵی ١٩٦٠ ل٧٣.

٤٢- (تلیشان) گوندێکی گەورەیە باخ و بێستانی تیادایە بە (٢٥) کیلۆمەترەیەك ئەکەوێتە خوارەوەی کفریەوە.

٤٣- بڕوانە (عشائر كردستان الجنوبية) وەرگێڕی لە ئینگلیزیەوە فوئاد حمە خورشید، چ ١٩٧٩ ، ل١٣٨ – ١٤٠ .

٤٤- ئەم دیوەخانەیە سەد ساڵێکە دروست کراوە وەك خۆی بە پتەوی بە پێوە وەستاوە، بریتیە لە دوو نهۆم لەهەر نهۆمێکدا سێ ژووری گەورە و هەیوان و بەردالانێك هەیە، بە بەردی مەڕمەڕ دروست کراوە.

٤٥- (وان) گەورەترین شارە لە کوردستانی تورکیا و کەوتووەتە سەر دەریاچەی (وان)ەوە بە پێی سەرچاوەکانی دەوری عوسمانی زۆربەی دانیشتووانی ئەم شارە و دەوروپشتی هەموو کورد زوبانن، بڕوانە: قاموس الإعلام التركي، شمس الدين سامی ط ١٣١٦ رومی جلد ٦ ،ل٤٦٧٢ هەروەها (الجغرافية العمومية للمدارس الثانوية والعالية المصرية) ط ١٩٢٣، ص ١٥٠.

٤٦- (جەمیل ئەکرەم ١٩١٠-) وای بۆ چووە ئەم دوو بنەماڵەش هەر (وەنداوی)بن لەگەڵ هلالدا هاتوون و ئەڵێت نەوەی (لاکەلی)یەکان لە کفریدا (توفیق ئاغا و عبدالكريم علی گوڵناز شەوکەت خدر و عبد الوهاب عوسمان و صالح لطیف)ن و نەوەی (ئوران قیلی)یش (خەلیل نەجاڕ و محمەدی عەلی حەمەلە)ن.

٤٧- مامۆستا (بەهجەت فەتاح وەنداوی ١٩١٤) لە کفری لە دایك بووە و نزیکەی سی ساڵێك مامۆستایی کردووە و ئێستا لە دانیشتوانی شاری بەغدایە.

٤٨- وەك (جەمال بابان ١٨٩٣ – ١٩٦٦) بۆ یەکەمجار لە ٣٠ی ئاداری ١٩٢٠دا بوو بە وەزیر (جەلال بابان ١٨٩٢ – ١٩٦٧)یش بۆ یەکەمجار لە ٣ی تشرینی دووەمی ١٩٣٢دا بوو بە وەزیر دوای ئەوە چەند جارێکی تریش کورسی وەزارەتیان ئاڵ و گۆڕ کردووە هەروەها (ئەحمەد موختار) (مەحمود بەگی جەمیل) بەگیش گەیشتوونەتە پلەی وەزیری.

٤٩- عومەر نەزمی (عومەری کوری حەسەن ئەفەندی ١٨٩٧ – ١٩٧٨) لە سیەکاندا بووەتە وەزیر و چەند جارێك لەم کورسی وەزرارەتەوە بۆ ئەو کورسی چووە جارێکیش (جەمال)ی کوڕی بووەتە وەزیر.

٥٠- مامۆستا (مەلا عبدالکریمی مودەریس ١٩٠٢-) لەم بارەیەوە ئەڵێت:

(محمد) أن (زەهاوی)و (حسن) أن (مردوخی)

در شهر (صلاحیه) از مشود منشر عرفان

((واتە محمدی زەهاوی و لە صلاحیە حسنی مردۆخی زانستیان بلاّو کردوەتەوە)).

٥١- لە موصلەوە (عەلی دەباغ) لە کفری دەباخانەیەکی گەورەی داناوە، ئێستا (خدر)ی کوڕی لە کفری نیشتەجێ بووە و وەچەی لێ بووەتەوە.

٥٢- خان – کاروانسەرا –کانی کفری ئەما نەبوون (خانی مەجید پاشا) خانی ئەورەحمان بەگی بابان، خانی سەید موحسین ئاغا، خانی سەید عومەر ئاغا، خانی سلێمان ئاغا، خانی حاجی رەشید، خانی حاجی کاظم، گەورەتریان خانی مەجید پاشای بابان بوو.

٥٣- ناوی ئاسیاوەکان ئەمانە بوون (ئاسیاوی قەرە دەگرمان – واتە ئاسیاوە رەشە، کویر پسك – پشیلە کوێرە، موسا بەگ، حاجی خەلیل، طور خای، عشە قباغ – واتە عشە کولەکە خۆر، چەتاڵ، مەلا عومەر، مەلا موسا، طوپچی، تەمر، حەمیرە، قازی، تولکی- رێوی، باش دگرمان – ئاسیاوی سەرەوە، ئاسیاوی حسن فتح الله، ئاسیاوی مەلا راغب).

٥٤- گەورەتریان (باخی پاشا – واتە باخی مەجید پاشای بابان – بوو) دوای ئەو (باخی قازی، باخی سەید عومەر ئاغا، باخی مستەفا ئەفەندی) بوو، ئەم باخە مارێکی گەورەی تیادا بوو هەر ساڵێ تا ساڵێك ئەیدا بەیەکێکەوە و ئەیکوشت لەدواییدا خاوەن باخەکەشی کوشت.

٥٥- وەك باخچەكانی (حاجی عوسمان، حەیارە، مەملی، حاجی تورشی، حاجی رەشید، موسا بەگ، خەلیل ئەفەندی، مەلا راغب، قوش قونماز) واتە: باڵندەی بەسەرەوە نانیشێتەوە.

٥٦- پاش (مەلا ئەحمەد) حاجی مەلا برایمی كوڕی ئەبێتە مەلای خانەقا و پاش ئەویش (جەمیل)ی كوڕی ماوەیەك ئەبێتە مەلای ئەو خانەقایە.

٥٧- (ئیسماعیل ئەفەندی كوڕی مەحمود) لە بنەڕەتدا لە هۆزی جافە و لە كفری ناوبانگی مەلایەتی دەركردووە و بووەتە مفتی، پاش خۆی (مەلا راغب)ی كوڕی بووەتە مەلای مزگەوتی سەیدەكان.

٥٨- (شێخ نظام الدین) لە كچی ئیسماعیل ئەفەندی (شێخ خالد)ی ئەبێت، ئێستا شێخ خالد نیشتەجێی بەغدایە و پەیوەندی لەگەڵ بنەماڵەی خاڵۆانیدا هەرماوە.

٥٩- (مەلا سەعیدی سوەیلی) لە كفری مستعد ئەبێت و ئیجازە لە (مەلا ئیسماعیل) وەرگرێ و مەلا ئیسماعیل كچێكی خۆی لێ مارە ئەكات، ئەو ئافرەتەی زۆر لا نامێنێت ئەمری خوا ئەكات، پاش ئەوە كچی (مبارەك ئەفەندی) ئەهێنێت، مەلا سەعیدی مفتی ساڵی ١٩٤٠ كۆچی دوایی ئەكات.

٦٠- وەك (عومەری كوڕی حەسەن ئەفەندی كە بە عومەر نەزمی ١٨٩٣ — ١٩٧٨) ناوبانگی دەركردووە، خزمەكانی ئەگێڕنەوە ئەڵێن كە لە ئەستەمۆڵ لێی ئەپرسن لەچی هۆزێكە ئەڵێت (كورد وەنداوی عشیر تندەنم — واتە من لەهۆزی كوردەكانی وەنداویم)، هەروەها (قاسم ئەروەت) كە ئامۆزای عومەر نەزمیە، ئەم پیاوە كە خوێندنی تەواو كرد لە كفریدا كورەیەكی گەورەی بۆ دروست كردنی (نورە — قسڵ) دامەزراند — ئەوسا وەك چیمەنتۆ بۆ بناغە دارژاندن بەكار ئەهێنرا — لە كفریەوە نوورەی ئەنارده بەغدا (عبدالفتاح) ناوێك بەخەڵكی بەغدای ئەفرۆشت لەوەوە ناوی ئەو شەخصە نرا (عبدالفتاح النورەچی) ئێستاش نەتەوەكەی ئەو ناوەیان بەسەرەوەدیە.

٦١- (کاك محمد سەعید جاف) گێڕایەوە کە لە ساڵی ١٩٧٢ لە تاران لەسەر شانۆیەکدا گوێی لەم گۆرانیە بووە بەئاوازی (رەبابە)ی کوڕەزای (مرادۆف)ی هونەرمەند و رەبابەی هونەرمەندیش لەدەم باو و باپیریەوە ئەمەی بۆ گێڕاوەتەوە.

٦٢- بەشێك لەدیوانی ئەم شاعیرەم دەستکەوتووە کە بەدەستخەت خۆی نووسیویەتەوە، لەدەرفەتێکدا بڵاوی ئەکەمەوە.

٦٣- بەشێکی زۆرم لە شیعرەکانی (عەبداڵ) دەستکەوتووە کە هەمووی بەکوردیە لەم نزیکانە گەلاڵەیان ئەکەم.

٦٤- لەگەڵ کاك (هەردەوێڵ کاکەیی) توانیمان دیوانی ئەم شاعیرە لە ساڵی ١٩٨٤دا بەناونیشانی (شاعیری چەوساوەکان خەلیل منەوەر) بەچاپ بگەیەنین و لەسەر ئەرکی (دەزگای رۆشنبیری و بڵاو کردنەوەی کوردی بەغداد) چاپ کرا.

٦٥- وەك (مستەفا ئەفەندی کوڕی مال الله — کە بە مستەفا رێژی — ١٩٦٠) ناوبانگی دەرکردبوو، مستەفا رێژی رۆشنبیرێکی شارەزای ئەدەب و مێژوو بوو کتێبخانەیەکی پوختی هەبوو، پاش خۆی حەوت کوڕی لێ بەجێما (جەمیل، حەکیم، خالد، جەلال، جەمال، کەمال، یوسف)، مبارەك ئەفەندی براشی شەش کوڕی هەبوو (قادر خلوصی، رەفعەت، مەدحەت، بەهجەت، کەریم، طەلعەت). مستەفا رێژی و مبارەك ئەفەندی برای چ لە دوا رۆژەکانی عوسمانلی چ لەکاتی ئیحتلال و حکومەتی عیراقدا وەزیفەیان بینیووە.

## بەشی سێیەم

## مێژووی هۆزی ( دەلۆ ) و هۆزەکانی دیکەی ناوچەی کفری

کۆمەڵگای عەشائری، (هۆزایەتی) بریتیە لەو پەیوەندیانەی کە کەسانی سەر بەهۆزێك پێکەوە ئەبەستێتەوە وەك پەیوەندی رەگەز و خوێن و خزمایەتی، هەر کەسێکی سەر بەهۆزێك ماڧ لەسەر هۆزەکەی هەبووە و پێویستی سەرشانی خۆی بەرامبەر هۆزەکەی دیاری کراوە، لە سەردەمی دوابڕاودا یاسایەکی تایبەتی بۆ هۆز و عێلاتەکان هەبووە کە (نظام دعاوي العشائر)ی پێ ووتراوە، پاش شۆڕش ئەم نیزامە پووچ کراوە، هاونیشتمانێتی و هاووڵاتی لە جیاتی ئەود چەسپاوە.

تا ئێستا لێکۆڵینەوەیەکی تایبەت و فراوان دەربارەی هۆزەکانی ناو کورد نەکراوە و پەیوەندی خزمایەتی نێوان هۆزە جۆر بەجۆرەکانمان دیاری نەکراوە، چەند گەڕیدە و رۆژهەلاتناسێك شتێکیان دەربارەی هەندێ هۆز و عەشیرەتەکانی کورد نووسیوە بەشێکی کەمیان نەبێت ئەو دواییان پڕ تەم و مژ و کون و کەلەبەرن. پرۆفیسۆر (ڤ. ف. مینورسکی)[١] دەربارەی هۆزەکانی ناو کورد ئەڵێت ((لەلایەن باری کۆمەڵایەتیەوە کورد ئەکرێتە چەند هۆزێکەوە، هۆزیش بریتیە لەدوو چین (یەکەمیان) جەنگاوەرەکانن کە سەرۆکی هۆز و دەست و پێوەندەکانیان ئەگرێتەوە (دووەمیان) ئەو بەشەن کە کشتوکاڵ ئەکەن، پەیوەندی کەسانی هۆز لەگەڵ سەرۆك هۆزدا هەست کردنە بەخزمایەتی بەجۆرێك بە پارچەیەکیان ئەژمێرن لە قوارەی هۆزەکانیان. جاربەجارێکیش بەچاو قارەمانێتیەوە ئەڕواننە ئاغە و گەورە هۆز وەك ئەوەی بڵێی لە رەگێکی تر بووبێت وەهایە، لە یەکەم تێڕوانیندا نێوان ئاغە و جوتیاران هەست بەجیاوازیەك لە نێوانیاندا ئەکرێت، ئەو –واتە ئاغە- وەك پیاوێکی بەشان و شکۆ و خاوەن دەسەڵات تەماشا ئەکرێت[٢].

دەربارەی هۆزەکانی ناو کورد و چۆنیەتی یەکگرتنیان (أ شامیلۆف)[٣] بەم جۆرە باسی کردووە ((... روانینە قۆناغەکانی گۆڕینی کۆمەڵگای کورد رووناکیەك ئەخاتە سەر ئەم گیروگرفتە –واتە لەڕووی پەیوەندی کۆمەڵایەتیەوە- کوردەکان لە مێژووی شەرەفنامەی خۆیاندا ئەڵێن، ئێمە لە کاتی خۆیدا یەك خێزان بوین، ئەمەش ئەوە ئەگرێتەوە ئەو کاتەی کە ژیان بۆ هەموو لایەك بەربڵاو بووە، پارچە ئەرز و مەڕ و ماڵاتی هەر هۆزێك بۆ هەموو کەسانی ئەو هۆزە بووە، واتە نە لە مەڕ و ماڵاتدا و نە لە ئەرز و کێڵگەدا موڵکایەتی بۆ تاکە کەسێك نەبووە، لەو قۆناغەدا هێشتا کۆمەڵگای کورد دابەش نەکرا بووە سەر چینەکانیەوە. لە سەدەکانی دە و یانزدەدا لەناو کۆمەڵگای کورددا چەند میرنشینێك پەیدا بون..)) شامیلۆف دەربارەی دەرەبەگی کورد ئەڵێت (جڵەوی دەسەڵاتی ئایینی و دنیاییان بەدەستەوە بووە رەش و رووتی کوردیان هێناوەتە ژێر رکێفی خۆیانەوە)[٤] هەروەها ئەڵێت (لە دیاردەکانی دەرەبەگایەتی ناو کورد ئەوەیە کە بەستراوەتە ژیانی کۆچەرایەتییەوە ئەمەیش وەهای کردووە کە پەیوەندی ناو هۆزەکە پتەو ببێتەوە بەجۆرێك ئەم دیاردەیە لەناو گەلەکانی رۆژهەڵاتی تردا بەرچاو ناکەوێت)[٥]، وە لەسەر گۆڕینی کۆمەڵگای کورد ئەڵێت ( لە دوا ساڵانی سەدەی هەژدەهەم و سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا سەرمایەداری بازرگانی لە هەموو کوردستاندا سەری دەرهێنا، بازرگانەکان دەستیان کردە کڕینی مەڕ و ماڵات و خوری و دەیان ناردە بازاڕەکانی شام و بەیروت)[٦].

دەربارەی پێکهاتنی کۆمەڵگای کوردەوە (س – أ یگیزارۆف)[٧] ئەڵێت ((کوردەکان لەناو خۆیاندا کۆمەڵگای بەتریارکی باوکێتی دیموکراتیان پێکهێناوە، هەموو لایەکیان دەوڵەمەند و هەژار چۆن یەك بەیەکسانی ژیان دەبەنە سەر)) دەربارەی چۆنیەتی هەڵبژاردنی سەرۆك هۆزەکانی ناو کورد زانای فەرەنسی (تۆما بوا) ئەڵێت ((گەیشتنی سەرۆك هۆز بە پایە و دەسەڵاتی خۆی بەپێی هەل و مەرجی ئەو هۆزە ئەگۆڕێت، یان ئەوەتا کوڕ لەشوێن باب دەسەڵات وەرئەگرێت

یان بەهۆی هەڵبژاردن نێوان پیاوە گەورە و ناسراوەکان یان حکومەت دەسەڵاتی خۆی بەکارئەهێنێت و گەورەیەك ئەسەپێنێتە سەر ئەو هۆزە))[٨].

خوالێخۆشبوو (محمد ئەمین زەکی) لە بەشی هەشتەمی (مێژووی کورد و کوردستان)[٩]دا ئەڵێت (مارك سایکس و مێجەرسۆن دەربارەی هۆزەکانی کوردی پێش شەڕی یەکەمی جیهانیان تۆمار کردووە، مارك سایکس هۆزەکانی کوردی ناو سنووری دەوڵەتی عوسمانی نووسیوە، مێجەرسۆن هۆزەکانی کوردی هەردوو دیوی سنووری تۆمار کردووە، ئەم دوو سەرچاوەیەم بەپوخت و تەواو نەزانی هاتم هەرچی سەرچاوەیەك دەربارەی هۆزەکانی کورد چیان نووسیوە وەرم گرتن تا ئەم کەلێنەم بۆ پڕ کرایەوە (محمد ئەمین زەکی بەگ لە مێژووەکەیدا ناو هەموو هۆزەکانی کوردی نووسیوە و بەرامبەر هەریەکێکیان شوێنی نیشتەنی و ژمارەی خێزان و تیرە و بەرەبابەکانیشی نووسیون.

ئەبێ ئەوەش بزانین کە (اصطخری) لە کتێبەکەیدا ناوی سی و سێ هۆزی کوردی نووسیوە (مەسعود)یش لە ساڵی ٩٤٣دا ناوی ئەم هۆزە کوردانەی تۆمار کردووە (شاهیجان، ماجوران، هازینی، شادانجان، لازما، مادانجان، مزدانکان، باریسیان، جلالی، جبارکی، جوانی، مستکان).

کتێبی (هۆزەکانی کورد — العشائر الكردية)[١٠]یش ناوی (٣٨) هۆز و بنەماڵەی کوردی هێناوە کە لە نێوان (زێی گەورە و سیروان)دا نیشتەجێ، وەك (ئاکۆ، هەورامان، باجەلان، جاف، بلباس، داودە، دەلۆ، جەباری، کاکەیی، شەرەفبەیانی، تالەبانی، زەنگەنە، زەند..).

**هۆزی (دەلۆ)**[١١]:

هۆزی (دەلۆ) تا دەوروبەری ساڵی (١٨٥٠) لە هەرێمی (سەنگاو)[١٢]دا بووە، هیچ بەڵگەیەکی ئەوتۆمان دەربارەی نیشتمانی پێش سەنگاوی هۆزی دەلۆمان دەست نەکەوتووە تەنها ئەوە نەبێت دەماودەم لە پیاوە بەتەمەنەکانی ئەم هۆزە

ـیستراوه[١٣] كه (دەلۆ) له بەرەبابی (دە) شۆڕە سواری هۆزی (بلباس) بوون و ـەسەر سنووری ئێران عوسمانیەكان نێوان (سنه و قەڵاچۆلان)دا بزێوییان ئەكرد ؛ مەترسییان خستبووه سەر سنووری هەردوو دەوڵەتەكەوە، جارێكیان كۆمەڵه ڕێگرێك ڕێ بەكاروانێكی بازرگانی ئەگرن، كاتێ ئەم دە برایه بەو هەواڵه دەزانن ـە چەتەكان ئەچنه پێشەوه داوایان لێ ئەكەن دەست لەبازرگانەكان هەلگرن، ـەوان بەمه قایل نابن، دە براكەش پەلاماریان ئەدەن و كاروانەكەیان له چنگ ـدرئەهێنن و ڕەوانەی مولكی بابانی ئەكەنەوە، میری بابان كه به نەبەردی و جەنگاوەری ئەم دە برایه ئەزانێت زۆر ڕێزیان ئەگرێت و هەرێمی (جامرێزی) ناو ـەنگاویان پێ ئەبەخشێت كه ئەكەوێته نێوان شاخەكانی (ئاج داغ و بەرگەچ)دوه ـە ڕۆژئاوای زنجیره شاخی قەرەداغی ناوچەی سەنگاو، پەنجا ساڵێكی بەسەردا تێئەپەڕێت وەچەی ئەو دە برایه ئەم ئاواییانه دائەمەزرێنن (بەرگەچ، مەسۆیی، عەینكه، كارێزه، ترشاوه، باجگه، پێنج ئەنگوست)، لەناو ئەم گوندانه (باجگه)یان ـوێنێكی ئیستراتیجی هەبووه، كەوتووەته سەرلوتكەی چیای (ئاج داغ) و ـارێزگاری ڕێگەی كاروانی نێوان (بەغداد و سلێمانی)یان تیا كردووه، كاروانسەرایەكیان له گەرووی سەنگاو بۆ حەسانەوەی بازرگان و قەتارچی و ڕێبوارەكان دروست كردووه، هەروەها لەو (باجگه)یەدا خەرج و باجیان له قەتار و كاروانەكان وەرگرتووه.

لەو حەلەوه كه دەلۆ هاتوونەته ناوچەی سەنگاو سەر بەمیرنشینی بابان بوون و باج و خەراج و سەربازیان بەدەوڵەتی عوسمانی نەداوه و بەربەرەكانیان لەگەڵدا كردووه، دەوڵەتیش هۆزەكانی ئەو ناوەی وەك (هەمەوەند و زەنگەنه)ی كردوون بەگژدا و تۆوی ناكۆكی له نێوانیاندا چاندووه، میرەكانی بابان هەمیشه لەگەڵ ئەم هۆزەدا بوون كاتێك ئەو میرنشینه لاواز بوو لەچاو وون بوو، ئاغەكانی زەنگەنەی ئەو ناوچەیه ئەم هەلەیان لەدەست نەدا پەلاماری دەلۆكانیاندا و دەیەها كەسیان لێ كوشتن، پیاوه ناسراوەكانی دەلۆش به ناعیلاجی شكاتیان بردە

بەر عوسمانلیە دوژمنەکانیان لە کەرکوك، ئاغەکانی زەنگەنەش کە زانیان دەلۆییەکان چوونەتە بەر دەرگای میری ئەمانیش چوون شکایەتەکانی ئەوانیان بەدرۆ خستووەتەوە و گۆڕی کوژراوەکانی دەلۆیان بەشەو هەڵتەکاندووە و لەجیاتی لاشەی هەر کوژراوێك پەزێکی سەربڕاویان خستووەتە ناو گۆڕەکەیەوە. والی کەرکوك دەست بەجێ لیژنەیەکی لێکۆڵینەوە ئەنێرێت و هەردوولا بانگ ئەکەن کە سەر گۆڕەکان هەڵ ئەدەنەوە ئەبینن وا پەزی سەربڕاوی تیادایە نەك لاشەی مردوو، ئەمە زەغەڵ و تەڵەکەبازیەك بوو کاربەدەستانی عوسمانی لە پشت پەردەوە هۆنیونەوە و ئاغەکانی زەنگەنەش جێبەجێیان کردووە و کاسەکەش بەسەر دەلۆیەکاندا شکاوە، هێزێکی گەورەی عوسمانلی داخ لە سگ بەربوونە سەر دەلۆییە بەسەزمانەکان[١٤] و لەو ناوچەیە هەڵیان تەکاندن و بەملا و بەولادا پرش و بڵاویان کردنەوە، لەوانە (ئەوڕەحمان جامرێزی) و هەردوو کوڕەکەی (یوسف و قازی) روویان کردە گوندی (ترکەشکانی) سەر بەناوچەی (قەرە حەسەن). ئەوڕەحمان لەداخا لەوێ مرد و (قازی) کوڕی چووە گوندی (شێردەرە) پاشان کوڕەکانی[١٥] چوونە کەرکوك و تا ئێستا ئەوان کوڕ و کوڕەزاکانی (رۆستەم)[١٦] لە کەرکوك نیشتەجێ بوون، هەر لەم ناوچەیەدا هەندێ لە دەلۆ ئاوارەکان کەوتنە گوندی (باداوا)ی ناوچەی قەرە حەسەن و بەشێکیان گوندێکیان لەسەر رووباری (خاسە)ی ناوچەی (شوان – رێدار) ئاوەدان کردەوە تا ئێستا هەر بە (دەلۆی سەر خاسە)[١٧] ناوبانگیان دەرکردووە. هەر سەرەنجامی ئەم کارەساتە (محمد بەفری)و هەردوو کوڕەکەی (عوسمان و ئیسماعیل) روویان کردە (کانی قادر)ی هەرێمی (قادر کەرەم) عوسمانیان دوو کوڕی ئەبێت (سەعید و ئیسماعیل) سەعید سێ کوڕی ئەبێت (حەمە، خورشید، سالح)[١٨] ئیسماعیلی برایشی سێ کوڕی ئەبێت (محمد، ئەحمەد، عەلی) پاش بەینێك کە کەف و کوڵی ئەو کارەساتە دامرکایەوە کوڕەکانی سەعید گەڕانەوە لە سەنگاو قشلاخە کۆنەکانی خۆیان ئاوەدان کردەوە.

زۆربەی زۆری کەسانی دەلۆ لێکتر جیابوونەوە بەڵکو کە لە مەڵبەندی خۆیان دوور خرانەوە روویان کردە هەردەو دۆڵەکانی رۆژهەڵاتی کفری و لەوێ لەسەر ئەم چەم و رووبارانەدا ئەم گوندەیان ئاوەدان کردەوە (سەرقەڵا، هەیەرەکەل، وەلیهەیەر، سەیجەژنی) رووبەری زەمینی ئەم گوندانە لەو سەردەمانەدا لەلایەن (قادر بەگی بابان)ەوە[١٩] وەك لەوەرگا دەوڵەت ئیلتیزام ئەکرا، چەند ساڵێکی بەسەردا تێ نەپەڕی جوتیارانی دەلۆ دەستیان کردە کشتوکاڵ کردنی زەوی و زارەکانی رۆژئاوای کفری ئەوەندەی پێ نەچوو ئەم دێهاتانەیان تیادا ئاوەدان کردەوە (کارێز، تەپەچەرمو، عەین شکور، عەین فارس، فەکە، کنگربان، گلآبات).

لەسەرەتای ئەم سەدەیەدا هەردوو دەوڵەتی هاوسنوور (عوسمانیو ئێران) کێشەی خۆیان یەکلا کرد و دەستیان کردە سنورکێشان و نوختە دروست کردن، داوایان لە هۆزی (دەلۆ) کرد کە چەند ماڵێکیان لێ بچێتە هەرێمی (خانەقی)و پارێزگاری سنووریان بکەوێتە ئەستۆ، زۆربەی هۆزەکە ئەمەیان بەدڵ نەبوو بەلآم (خورشیدی کوڕی عبد القادر) کە لەوەولا بە (خورشید بەگ) ناوبانگی دەرکرد خۆیان و چل خێزانێك لە خزمە نزیکەکانی لە نارێنەوە[٢٠] بەیەکجاری هەڵکەندران و کردیانە ئەوبەری سیروان و ئاوایی (کانی بز)یان بۆ خۆیان ئاوەدان کردەوە[٢١] کە نزیکەی کیلۆمەترەیەك لە سنوورەوە دوور بووە، پێش ئەوەی ئەم بەشە دەلۆیانە کۆچ بکەنە هەرێمی خانەقی بەشێك لە دەلۆییەکان هەر لە سەنگاو هەڵکەندرابوون ئەوەندە لە هەرێمی (سەرقەڵا)ی رۆژهەڵاتی کفری نەحەسانەوە بەڵکو بە کۆچ و بارەوە ملی رێگەیان گرتەبەر نەوەستان تالە سیروان پەڕینەوە ئەوبەر[٢٢]. هەر کە پاش چەند ساڵێك خزمەکانی تریان کردیانە ئەوبەری سیروان ئەوا یەکیان گرتەوە و ئەم گوندانەیان پێکەوە ئاوەدان کردەوە (کانی ماسی، نەوت خانە، پیکە، عەین هلال) بەمە وەچ و خێزانی (حەسەن کەنۆش)و (ئەوڕەحمان بەگی) تێکەڵاو بەیەك بوون و بەشێکیان روویان کردە شاری خانەقی و دەسیان

کردە کاسبکاری ئەو دوایيان بە کشتوکاڵەوە لەدێهاتە نزیکەکانی[٢٣]دەورووپشتی خانەقی نیشتەجێ بوون.

ئەمە بوو ڕێڕەوی ئەم هۆزە نەبەردە ئاوارە بووە کە لەم ڕۆژگارەماندا زۆربەیان لە ئاواییەکانی ڕۆژهەلاَت و ڕۆژئاوایی کفریدا[٢٤]نیشتەجێن ئەم عەردەی بەدەست دەلۆییەکانی ڕۆژهەلاَتی کفریەوەیە لە پێشدا موڵکی بابانەکان بووە و دوایی بووەتە موڵکی بەگزادەکانی جاف, عەردی دوو دێی ڕۆژئاوای کفری (کنگربان و ساری گۆل) کە نیشتەنی دەلۆیە موڵکی بابەنەکانە ئەو دوایی عەردەکانیان موڵکی میریە و بەدەست خۆیانەوەیە.

دەلۆی ئەم بەر و ئەو بەری[٢٥] سیروان لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا کارێکی زۆریان کردبووە سەر ڕووداوەکانی ناوچەکەیان بە ئازایەتی و نەبەردی خۆیان سەپاندبووە سەر ڕووداوەکاندا و پیاوانی وەك (کەمەرخان، برایم خان، وەیسی بەگ، خورشید بەگ، مەحمود بەگ، فتح الله بەگ، حەمیدی ئەوڕەحمان کارێزی، کاکەمەند)یان تیاهەلکەوتووە کە هەریەکەیان شۆڕە سوارێك بووە بۆ خۆی و شوێن پەنجەی خۆیان لە ڕووداوەکاندا دیاری کردووە، ملیان بۆ داگیرکەر دانەنواندووە، ئەم هۆزە ئەوەندە بەتەك ئابڕو و سەربەرزیەوە هاتوون ئەوەندە لایان لە ماڵداری و موڵکداریەوە نەکردووەتەوە، هەرگیز پشتیان بە ماڵی دنیا قایم نەکردووە، سەرەڕای گۆڕینی ڕەوتی زەمان هێشتا ئەو خو و ڕەوشتە پاك و بێ گەردە لە بەشێکی فراوانی نەوە و وەچی ئەو ناودارانە ئاشکرا و دیارە، لە دێڕەکانی داهاتوودا چەند نموونەیەکی زیندوو لە هەڵوێستی هەندێ لەو ناودارانەتان لە هۆزەکەیاندا بۆ ئەخەمە ڕوو.

**دەرکەوتنی کەمەرخان( ٢٦ ):**

هەرچەندە دەوڵەتی عوسمانی لەسەرەتای ئەم سەدەیەدا لات و لاواز کەوتبوو، بەلاَم کاربەدەستانیان لە ناوچە داگیرکراوەکاندا لە پاڵەوە گورزی خۆیان

هەر ئەوەشاند و خەڵکیان ئەچەوساندەوە، ئەوەندە خەرج و بەراتی جۆربەجۆری وەك (سەرانە) و (کەرانە) و (ئەعشار) و (ئەغنام)یان خستبووە سەر خەڵك عالەمەکە لە ژێر ئەوبارەدا ناڵەیان لێ بەرز ببووەوە، لەلایەکی ترەوە ئەرز و ئەملاکیان بەسەرۆکەکاندا دابەش ئەکرد تا ئەوانیش لە چەوساندنەوەی میللەتەکەیاندا هاوکاریان لەگەڵ بکەن، لەو هەل و مەرجەدا (کەمەری کوڕی صالح خانی دەلۆ) کە برا گەورەی (برایم خان) بوو سەری بەرزکردەوە و شۆڕشێکی لە ناوچەی کفری بەرپا کرد و چووە گژ کاربەدەستانی عوسمانی و ئەو کەسانەی سەر بە ئەوان بوون ژیانی پێ تاڵ کردن، چەند جارێك دەوڵەت هێزی بردە سەر، (کەمەر خان)یش ئەکشایە هەردەکانی رۆژهەڵاتی کفریەوە و خۆی لێ قایم ئەکردن ئەگەر بەرەو پێشتر تەکانیان بدایە ئەوا پەرت و بڵاوی ئەکردنەوە و هەرجارە ناجارێ چەند کەسێکی لێ ئەکوشتن، دەوڵەتی عوسمانی هانای بردەبەر هۆزەکانی ناوچە، کەس بەدەنگیانەوە نەهات، چوو لە هۆزی هەمەوەند هێزێکی سەد و پەنجا سواری بەسەرۆکایەتی (حسین ئاغا)وە هێنا، ئەم هێزە شان بەشان عوسمانیەکان لەناکاو پەلاماری هێزەکەی کەمەرخانیاندا، چەند رۆژێك شەڕ گەرم بوو، هێزەکەی کەمەر خان دوا گوللەیان پێ بوو تەقاندیان و ئەوەبوو خۆی و حسێنی برای لە ساڵی ١٣١٢ی کۆچی رێکەوتی ١٨٩٥ی زایینی لەگەڵ چەند قارەمانێکی تردا خوێنی ئاڵیان تێکەڵ بەخاکی نیشتمانەکەیان بوو، دەوڵەت تەرمی ئەم دوو شەهیدەیان هێنایە کفری بەتەما بوون لاشەیان لەناو کوچە و کۆڵانەکاندا رابکێشن، بەڵام هەمەوەندەکان و دانیشتووانی شار ئەم کارەیان رەت کردەوە و چوونە سەر کاربەدەستان، لاشەیان یەك دوو رۆژ لەو راستیە کەوتبوو (نەنەخان)ی دایکیان هات و بێ ئەوەی فرمێسکیان بۆ برێژێت نوێژی لەسەر کردن و تەرمی رۆڵەکانی بردەوە ئاوایی، ئێستا بەرامبەر ئاواییەکەی خۆیان هەر لەسەر جادەکەی (کفری – سەرقەڵا) لەسەر تەپۆڵکەیەك هەریەکەیان کێڵێکیان لە

ژوور سەردا بەرزبووەتەوە و شایەتی شەهادەتیان بۆ ئەدەن کە لەڕێی سەربەرزیدا خوێنیان رژاوە.

هۆزی دەلۆ بەتەنگ و چەڵەمەی سەختدا تێپەڕیوە و ئەمەش وەك تاقیکردنەوەیەك وابووە کە دەلۆییەکان زیاتر پێکەوە بچەسپێت، پێوەندی نێوان جوتیارانی ئەم هۆزە و سەرۆك هۆزەکەیان پەیوەندیەکی باوکایەتیە، سەرۆك هۆزی دەلۆ خاوەن ئاو و خاك و دەسەڵاتی ئەوتۆ نەبووە و باج و سەرانەشی نەخستووەتە سەر جوتیارانی خزمی و لەزۆربەی دێهاتەکانی ناو دەلۆدا بەشی گەورە و دێی جوتیارێك ئەوەندەیان فەرق نەبووە، دەرەبەگایەتی و چەوساندنەوە و روتاندنەوە لەناو ئەم هۆزەدا بەرامبەر بەیەك نەبووە، جوتیارێکی دەلۆیی ئەگەر سەرۆك هۆزەکەی خۆی خۆشویستبێت ئەو خۆشەویستیەی لەکانی دڵەوە هەڵقوڵاوە نەك لە ئەنجامی دەسەڵاتداری و ترسەوە بێت، ئەمە یەکێکە لەدیاردە بەرچاوەکانی باری کۆمەڵایەتی و رامیاری ئەم هۆزە کە لە هۆزەکانی دەوروپشتی خۆی جیای کردووەتەوە.

لەناو هۆزی دەلۆدا چەند شاعیرێك ناوبانگی دەرکردووە یەکەمیان — میرزا شەفیعی جامرێزیە (١٧٨٥ — ١٨٣٥)ی زایینی میرزا شەفیع لەو سەردەمە ناوبانگی دەرکردووە کە دەلۆ هێشتا لەناوچەی سەنگاودا بووە، خۆیشی لە گوندی (جامرێز)دا بووە، لەوەسف کردندا دەستێکی باڵای هەبووە، ئەمە پارچە شیعرێکیتی کە لەگەڵ دارێکدا ئەدوێ:

هامسەران جارێ هامسەران جارێ:

رام کەفت وە گوزەر درەختێك جارێ

درەخت چی درەخت قامەت چنارێ:

بەرز بەهرەمەند ساوای وەن دارێ

سەر جەکەشکەڵان حەفتەمین یەرد:

ریشەی پا نەتەخت زەمین مەحکەم کەرد

واتەم: پیرەدار مەنەی هەزار ساڵ:

شەرحێك جەی دەوران باوەڕ وە خەیاڵ

خەیلێك زەمانە جەبیر ناوەردەن:

شادیت وە زەمان کام شاهان بەردەن

دیم دەنگێك ئاما جەی نیگارەوە:

جەی میناى شکست هەزار پارەوە(٣٧)

دووەم — حەسەن کەنۆش (میرزا حەسەن جنونی ١٨٤٠ — ١٨٩٤) ئەم شاعیرە لەگەڵ مەحاکی داودیدا هاوچەرخ بووە و لەنێوانیاندا چەند کاغەزە شیعرێك هەیە، ئەمیش چەند دێرێکە لە یەکێك لەو کاغەزانەی کە حەسەن کەنۆش بۆ مەحاکی نووسیوە:

چـراغـم سـیا چـراغـم سـیا: (مـەحـاك) لە دونیا چراغـم سـیا

بەو خوا قەسەم ئـەی دنیاش نیـا: سەد سفیدەن غولام تـای زولف سـیا

سـفید بێ سـیا زینەت نەدارۆ: جەوهەر سـیا رەحمـەت مـەوارۆ

(حجر الاسود) چووین سەنگش سیا: سەرجەم حاجیان وە عـەینەش نیا

سی جزمەی کەلام خەڵات رەسول: خطش سیابی، کەردشـان قبوول(٣٨)

هەروەها (فاتمە)ی کچی حەسەن کەنۆشیش شاعیرێکی ناودار بووە و لەگەڵ شێخ رەزای تاڵەبانی بەشیعر هێرشیان بردووەتە سەریەك.

وەك لە سەرەتای ئەم بەشەدا دەرمان بڕی هۆزی دەلۆ لە رەگ و ریشەدا ئەچنەوە سەریەك بەرەباب ساڵ بە ساڵ کەسانی ئەم هۆزە وەچەیان لێ بووەتەوە تا وەهای لێ هاتووە لە ماوەی سەدە و نیوێکدا ئەم هۆزی (دەلۆ)یە بکرێتە (دە) تیرەوە، ئەمانەش ناوی تیرەکانی دەلۆن:

١- جامرێزی: لەکاتی خۆیدا لە ئاوایی جامرێزی ناوچەی سەنگاودا بوون و ئەو ناوەیان بەباڵادا براوە و جلەوی سەرۆك هۆزەکەی خۆیان تا ماوەیەك بەدەستەوە بووە، لەپیاوە بەناوبانگەکانیان (مستەفا و عوسمان) بوون و لەم دواییەشدا (عەلی عەزیز و حەمید عەزیز)یان هەبووە، هەرچەندە ئەم تیرەیە بە بەگزادە ناسراون بەڵام دەورێکی ئەوتۆیان نەگێڕاوە.

٢- ئەورەحمان بەگی – ئەمانەش لە بەگزادەکانی دەلۆن، لە پیاوە ناودارەکانیان (فتح الله بەگ و عبدالله بەگی برای، سەمین ئەمین بەگ، ئەحمەد محمد بەگ، حەمید رەشید بەگ)، لە ناسراوەکانی ئەمڕۆیان (فەرحانی عبدالله بەگ و مەجیدی فتح الله بەگ و زوهدی ئەحمەد بەگ و ئیسماعیلی رەشید بەگە).




٣- سەلیم وەیسی – لە پیاوە بەناوبانگەکانیان (وەیسی بەگ) بووە، وەیسی بەگ نزیکەی بیست ساڵ (١٩٠٥ – ١٩٢٥) سەرۆکی هۆزی دەلۆ بووە، چ لەناو

هۆزەکەی خۆی و چ لەناو جەماوەردا پایە و مەقامی خۆی هەبووە و ڕێزی گیراوە، چەند جارێك چووەتە لای شێخ مەحمودی حەفید و یەکێك بووە لەناودارەکانی کفری کە داوای مافی کردووە، وەیسی بەگ ماڵێکی لە عەین فارس و ماڵێکیشی لەکفریدا بووە، لەبەرەی سێ ژن ئەم کوڕانەی هەبووە (عەلی، حەسەن، حەمید، مەجید، مستەفا، جەوهەر، نامق) ئەم برایانە هیچیان نەماون، کوڕەکانیان لەکفری و عەین فارس و شوێنانی تردا نیشتەجێ بوون، ناسراوترینیان (سامی عەلی وەیسی بەگە ١٩٢٤) و ئێستا لە کفری دائەنیشێت، شاعیر و ڕۆشنبیرە.




٤- خوبیاروەندی (کەمەرخان و برایم خان) لە پیاوە ناودارەکانی ئەم تیرەیەن زۆربەیان لە ئاواییەکانی (هەیەرە کەل – برایم خان) دائەنیشن و بەکشتوکاڵەوە خەریکن، لە دەلۆی ئەو بەریش (دەوروپشتی خانەقی) ئەمین عەلی لەم بنەماڵەیە لەپیاوە ناودارەکانی ئەم تیرە دەلۆییە (شەرەفی برایم خان و سمایلی عەزیزی برایم خانە).

٥- گەچی – باپیرە گەورەیان لە (بەرگەچ)ی سەنگاودا بوون، کە هەڵکەندران هاتنە دەوروپشتی کفری و کەوتنە ئاواییەکانی (کارێز و گلاّبات و عەین شکور) لە ناودارەکانیان (کوێخا ئەوڕەحمانی کارێزی و حەمید و حاجی

**محمدی کوڕی) هەروەها (ئەمین دەروێش) و نەوەکانی وەك (کاکەمەندی ئەمین دەروێش).**

درەختی رەگی دەلۆی کاریزی (کوێخا)

سلێمانی کوڕی ئەحمەد کۆر مەحمود کور مەلاجان




درەختی رەگی دەلۆ



تەلکەوەندی (تەرکەوەندی) لەسەر قەلاّ و سەی جەژنی نیشتەجیّ بوون لە پیاوە ناودارەکانیان (خەسرەو حەسەن نادرە شیّت)بووە و ئیّستا (فەریقی کویّخا مەدحەت) لە پیاوە ناسراوەکانیانە.

٦- پیّنج ئەنگوستی – لە دەوروپشتی خانەقیدان لە ناودارەکانیان (قادر شەریف) بووە.




٧- ئالی نەزەری – لە ناودارەکانیان (محمد خدر) بووە.

٨- تائشەیی – لە ناودارەکانیان (فەرەج سەعید) و خزمەکانیّتی.

٩- چەرمەوەی – لە کەسە ناودارەکانیان (محمد بەفری) بووە.

هۆزی دەلۆ کەم تا زۆر لەگەلّ ئەم هۆز و عەشیرەتانەی دەوروپشتی کفریدا پەیوەندی هەبووە وەك (جاف، زەنگەنە، داودە، تالّەبانی، بەیات، گیّژ، عەززە، لهیّب) و ناویان لەم کتیّبەدا هاتووە بۆیە بەپیّویستی ئەزانین لە هەریەکەیان کورتەیەك زانیاری پیّشکەش بکەین.

**هۆزی ( جاف )**[٢٩] :

جاف بەگەورەترین هۆزی کورد ئەدریّتە قەلّەم، تا سەدەی حەڤدەمی زایینی ئەم هۆزە لە هەریّمی (جوانرۆ)[٣٠]دا بوون، کە سوپای عوسمانی بەسەرۆکایەتی (مورادی چوارەم) سەرکەوتە سەر سوپای ئیّران بەسەرۆکایەتی (صفی الدینی یەکەم) لە سالّی ١٦٣٩دا ریّکەوتنی (زەهاو)یان لەناو خۆیاندا مۆر کرد سەرەنجامی ئەو ریّکەوتنە بەشیّك لە هۆزی (جاف) کەوتنە ئەم دیوی

سنووری عوسمانی و پێیان وترا (جاف موورادی) و ئەوانەی لە جوانڕۆدا مانەوە پێیان ووترا (جاف جوانڕۆ)یی، لە سەردەمی حوکمڕانی (ئەحمەد پاشای بابان) لە ساڵی ١٧٧٢دا (زایەر بەگی جاف) لەگەڵ سەد کەسێك لە دەست و پێوەندی هاتنە هەرێمی (بانی خێڵان) و[٣١] لەو ناوچەیە جێنشین بوون.

سەرژمێری جاف لەناو سنووری دەوڵەتی عوسمانیدا رۆژ بەرۆژ پتر دەبوو تا ئەو هەرێمەی تیادا بوون بەشی نەئەکردن و بەرەو خوارەوە ئاخێزیاندا و تەنگیان بەوردە هۆزەکانی وەك (زەند، پالانی، گێژ، شەرەفبەیانی)[٣٢] هەڵچنی و لەشوێنی خۆیان هەڵیان تەکاندن تاوەکو سنووری نیشتەنیان گەیشتە دەوروپشتی کفری و خانەقی و قەرەتەپە.

پاش لەناوچوونی میرنشینی بابان ئەستێرەی ئەم هۆزە درەوشایەوە و لەلایەن دەوڵەتی عوسمانیەوە[٣٣] پارێزگاری سنووریان پێسپێردرا و هەندێك لە بەگزادەکانیان پلەی (پاشا)یی[٣٤] پێ بەخشرا وەك (محمد بەگی کوڕی کەیخوسرەو بەگ – محمد پاشا) و هەردوو کوڕەکەی (مەحمود پاشا و وەسمان پاشا).

جاف لە ئەعشار و سەرانەی دەوڵەتی عوسمانی لادرابوون لەجیاتی ئەمە هەرخێزانێك ساڵێ (٨٧,٥) قروشی بەگەورە هۆزەکەی خۆی ئەدا، واتە تەنها بەگزادەکانی جاف بەرپرسیار بوون بەرامبەر دەوڵەت و ئەوانیش پەیوەندییان بەکەسانی ناو هۆزەکەی خۆیانەوە هەبوو نەك دەوڵەت.

لەزۆر کۆنەوە جاف گەرمیان و کوێستانیان کردووە لەم کۆچ کردنە نزیکەی (١٢٠٠) کیلۆمەترە رێگەیان بەکۆچ و بارەوە بڕیوە، قۆناغ بە قۆناغ پەزەکانیان داوە لەبەر و رۆیشتوون، لە کوێستانەوە کە هاتوونەتە خوارێ لە نزیك ئەم شوێنانەوە تێپەڕیان کردووە (بیجار، سەقز، سنە، بانە، مەریوان، پێنجوین، میشیاو، ملەکەوە، عەربەت، سلێمانی، تەیناڵ، قەرەداغ، سەنگاو، سەرقەڵا، کەلار، زەنگابات، قەرەتەپە)[٣٥] لە بڵاوبوونەوەی هۆزی جاف لە گەرمیان و کوێستان هەر تیرەیەکیان پێ لەوەڕ و شوێنی دیاری کراوی خۆی

هەبووە هیچ تیرەیەکیان نەئەچووە سەر لەوەڕگای ئەویتریان، ناوچەی گەرمیان لەو دواییەدا بەهۆی زۆری کشتوکاڵەوە نەی ئەگرتن ناچار پەل و پۆیان ئەکوتایە ناوچەی قادر کەرەم و قەرە حەسەنیشەوە تا ئێستاش لەناوچەی قەرە حەسەن دێیەك هەیە بەناو (جافان)ەوە و هەندێك لەو تیرە و ماڵانە ئەیانکردە ئەوبەری سیروانەوە ئەگەیشتنە هۆرێنو قۆرەتوو زەهاوی قزرابات، لەو ڕێڕەوەدا هۆزی (گەلاڵی) کە بە ئازایەتی ناوبانگیان دەرکردبوو ئەکەوتنە پێشەوە، بەگزادەکانیش لە ناوەڕاستی ئەو قەتارەدا بوون، زۆر جاریش هەبوو بەگزادەکان زستانیان لەقزرابات ئەبردە سەر، گەورەکانی جاف (پاشا و بەگزادە) سەنگین و سەربەرز بوون، ئەوەندە قسەیان نەئەکرد، بەڵکو کتوپڕ شتیان بەجێ ئەهێنا[٣٦] — واتە بەکار و کەم دوو بوون، لەکاتی کۆچەرایەتیدا هەر خێزانێکی جاف رانێك دوو رانە پەزی هەبوو چاکترین ئەسپیان بەخێو ئەکرد و حەیوانی دۆشەنی وەك مانگایان بەخێو ئەکرد و باریشیان لێ ئەنا، لە گەرمیاندا بەروبوومی پەزەکانیان لە بازاڕی کفریدا ساغ ئەکردەوە وەك (خوری، موو، پەنیر، ماست، رۆن) جگە لە قاڵی و گلێمی نەخشین.

لە ساڵی ١٩١٨وە هۆزی جاف لە لەوەڕگەرییەوە روویان کردە کشتوکاڵ کردن تا ساڵی ١٩٢٢ پێنج هەزار ماڵە کۆچەری لێ مایەوە ساڵی ١٩٤٧ ژمارەی خێزانە کۆچەرەکانی جاف هاتە خوارەوە تا گەیشتە (٦٠٠) خێزان، لە ساڵی ١٩٧٠ ژمارەی خێزانە کۆچەرەکان لە سەد تێ نائەپەڕێن[٣٧].

مێژووی کورد و کوردستان هۆزی جافی دابەش کردووەتە سەر ئەم تیرە و لقانەوە (هارونی، ئیسماعیل عوزێری، مکایەلی، رەشو بۆری، تەرخانی، رۆغزایی، شاتری، سەدانی، باشکی، عەمەلە، یوسف جانی، نەورۆلی، کەمالەیی، یەزدان بەخشی، تاوگۆزی، پشت ماڵە، بێ سەری، یارەویسی، شێخ ئیسماعیلی، عیسایی، صۆفیوەند)[٣٨]. لەناو بەگزادەی جاف ئەم سەرکردانەیان ناوبانگی دەرکردووە:

١- محمد پاشا (کوڕی کەیخوسرەو بەگی سلێمان بەگی زایەر بەگە) ساڵی ١٢٣٠ کۆچی لەدایك بووە، پاش مردنی باوکی لە ساڵی ١٢٤٤ بووەتە سەرۆکی جاف، محمد پاشا پیاوێکی ئازا و چاوتێر و رۆشنبیر و بەزەوق بووە، لەسەر گردی شیروانەی بەرامبەر کەلار (قەڵای شیروانە)ی[٣٩] دروست کردووە، جگە لەوەی لەناوچەی پێواز قەڵایەکی تری کردووە و لەقزراباتیش خانوویەکی گەورەی کردووە، چەند جارێك ناکۆکی کەوتووەتە نێوان حەمە پاشا و دەوڵەتی عوسمانیەوە، حەمە پاشا لە ساڵی ١٢٩٩دا بەدەست چەند کەسێکی کەرەم وەیسی نزیك شاری کفری[٤٠] کوژراوە.

٢- مەحمود پاشای کوڕی حەمە پاشا-ساڵی ١٢٦١ لە دایك بووە، کە گەورە بووە بووەتە قایمقامی هەڵەبجە، پاش مردنی باوکی سەرکردایەتی جافی وەرگرتووە، لە ساڵی ١٣٠٦دا کراوەتە موتەسەریفی (ئورفە) و لەجیاتی ئەو (وەسان پاشا)ی برای کراوەتە سەرۆکی جاف، بەڵام نەچووەتە ئورفە، لەلایەن دەوڵەتەوە گیراوە لە ئەستەمۆڵدا حەپس کراوە، پاش چەند ساڵێك لە بەندیخانە رایکردووە و بەسەر قەوقاسەوە چووەتە ئەزربایجان و لەوێوە هاتووەتەوە ناو جاف لەچیای زمناکۆ شۆڕشێکی دژی دەوڵەت بەرپاکردووە، دەوڵەت لە نەبەردی مەحمود پاشا سەری سوڕماوە و داوای رێکەوتنی لەگەڵ کردووە ئەویش بەبێ ئەوەی بترسێت چووەتە ئەستەمۆڵ و سوڵتانی دیووە ئەویش یانزدە مقاطعەی لەقەزاکانی هەڵەبجەو کفری و دەوروپشتی سلێمانی پێ بەخشیوە، مەحمود پاشا لە ساڵی ١٣٣٩ی کۆچیدا ئەمری خوای کردووە[٤١].

٣- وەسمان پاشای کوڕی حەمە پاشا - ساڵی ١٢٦٣ لەدایك بووە، ساڵی ١٢٩٠ لەلایەن دەوڵەتی ئێرانەوە کراوەتە فەرمانڕەوای (جوانڕۆ و زەهاو) پاش چوار ساڵ گەڕایەوە ناو خاکی دەوڵەتی عوسمانی بیست ساڵێك سەرۆکی جاف بووە، ساڵی ١٣٢٧ کۆچی دوایی کردووە لە (عادلە خانمی) ژنی دوو کوڕی هەبووە (ئەحمەد موختار ١٨٩٦ - ١٩٢٣) و (طاهر بەگ - ١٩٢٧) کە

هەردووكیان شاعیر بوون و دیوانی شیعریان لە چاپدراوە – لەناو جافدا شاعیری وەك (وەلی دێوانە) و زانای بەناوبانگی وەك (مەولانا خالید ١١٩٢ – ١٢٤٦ كۆچی) ناوبانگیان دەركردووە.

لەسەردەمی شۆڕشی برایم خانی دەلۆدا (كەریم بەگی فەتاح بەگی حەمە پاشا ١٨٨٥ – ١٩٤٩) سەرۆكی جاف بووە و دەورێكی گرنگی بینیوە كە لەكاتی خۆیدا نەیخەینە روو.

**هۆزی ( داودە ):**

داودە هەرێمێكی فراوانی گرتووەتەوە لەنێوان رووباری (رۆخانە) و دۆڵی (هۆمەربل – عمربیل) و كەوتووەتە ناوەندی ئەم هۆزانەوە (شێخان، جاف، تاڵەبانی، زەنگەنە، دەلۆ، بەیات) داودە لە هۆزە دێرینەكانی كوردە نزیكەی دوو هەزار خێزانە و لە شەست ئاواییدا بڵاوبوونەتەوە لە شەش تیرە پێكهاتووە (شێخەوەند، پیرام وەند، كەرەم وەند، خەڵەف وەند، دیلانی، قەواڵی، بارنەوەری) جگە لە چەند لق و بەرەبابی بچووكی تر وەك (لەك، زەند، گۆمەیی، سالەیی) ، (مەحاك)[٤٣] لە شاعیرە بەناوبانگەكانی ئەم هۆزەیە شوێنی هەرە كۆنی ئەم هۆزە لەناوچەی (قەڵا داود)ی كوردستانی ئەودیودا بووە، كە مەغۆڵەكان بەسەرۆكایەتی (هۆلاكۆ) هێرشیان هێنا هەندێ لەم هۆزە توانیان بەسەرۆكایەتی (حەقی)یەوە بەرەو رۆژئاوا خۆیان رزگار بكەن تا گەیشتنە ناوچەی ئێستایان و تیادا جێگیر بوون، بەشێك لە داودەییەكان لە وڵاتی مەغریبدا ئەژین لە هەرێمی (مەكناس)[٤٤] جێگیر بوون و پەیوەندیان لەگەڵ هۆزەكەیاندا هەرماوە، داودە بەپێی شوێنی نیشتەنیان ئەكرێنە دوو بەشەوە: (داودەی كوردستان) ئەوانەی لە دێهاتەكانی ناو چیا و هەردەكانی رۆژهەڵاتی (دوزخورماتوو) ئەژین وەك (قەڵخانڵو، عەزیز قادر، توكن، تەپەچەرمو، دوراجی، زندانە، پەلكانە، مازوغ، سماق) بەشی دووەمیان (داودەی گەرمیان) ئەكەونە پێ دەشتی رۆژئاوای دوز تا نزیك تاوغ (داقوق) لە

گوندەکانی ئەم ناوچەیان (حەوت تەغار – افتخار، ئەلبو سەراج، عەلی سەرای، چەورکە). سەرۆکایەتی ئەم هۆزە لەدوا ساڵەکانی عوسمانیەکاندا بەدەست (حەمە خورشید ئاغا)وە بووە لە دوڕاجی قەڵایەکی دروست کرد و لەو ناوچەیە کەوتە بەربەرەکانێ دژی دەوڵەتی عوسمانی ئەوانیش هێزێکی قورسیان نارده سەر و قەڵاکەیان دایە بەرتۆپ، ناچار جەنگاوەران تارومار بوون (حەمە خورشید) خۆی و چەند سوارێك هەڵاتن و لە سیروان پەڕینەوە و روویان کردە چیای (بەمۆ) لەوێ خۆیان قایم کرد، هەندێ لەو هۆزەش دوورخرانەوە بۆ ناوچەی (رەمادی)وە تا ئێستا بە بەرەی (دوڕاجی) ئەناسرێن. دەوڵەتی عوسمانی چەندە هەوڵیدا حەمە خورشید[٤٥] بگەڕێتەوە سوودی نەبوو تا ئەو دەوڵەتە لە ئارادابوو نەگەڕایەوە چونکە لە دوژمن دڵنیا نەبوو بوو.

هەر کە سوپای داگیرکەری بەریتانی پێی نایە سەر خاکی عیراق و بانگەوازی (جهاد) دژ داگیرکەر بەرز بووەوە شۆڕە سوارانی هۆزی داودە بەسەرۆکایەتی (نامق ئاغا) تێکەڵ بە هەزار سوارەکەی شێخ محمودی حەفید بوون، لە شەڕی (شعیبە)دا نامق ئاغا چەند جەنگاوەرێکی شەهید بوون و بەخوێنی ئاڵیان لی دەشتی شعیبەیان رەنگ کرد.

درەختی داودە (بەگ)



له سیەکاندا (خەڵەف شەوقی داودی) ناوبانگی دەرکرد، خەڵەف شەوقی ساڵی ١٨٩٨ لەدایك بووە، خوێندنی لە قوتابخانەکانی عوسمانیدا تەواو کرد و لە جەنگی یەکەمی جیهاندا بەشداری کردووە و لەلایەن ئینگلیزەوە بەدیل گیراوە و ڕەوانەی هندستان کراوە، لەوێ ئینگلیزی و هیندی فێر بووە، کە گەڕایەوە دەستی دایە ڕۆژنامەگەری لە ڕۆژنامەکانی (ئەوقاتی عیراقیە) لە بەسرە و (ئەوقاتی بەغدادی)دا کاری کردووە خۆیشی گۆڤاری (شط العرب)ی دەرهێناوە لە ساڵی ١٩٣٦یشدا ڕۆژنامەی (الدفاع)ی لە بەغداد دەرهێناوە، چەند ساڵێك لە وەزارەتی (مالیە)دا فەرمانبەر بووە لەنووسین و ڕەخنەگرتندا شێوەیەکی تایبەتی هەبووە، نەبێ ئەوەشمان لەبیر نەچێت کە خەڵەف شەوقی لە ساڵی ١٩٢٧دا یەکێك بووە لە دەستەی دامەزرێنەری کۆمەڵی (پشتیوان) لەگەڵ ئەم کەسانەدا (ڕەفیق حیلمی، مستەفا شەوقی، ئەحمەد خواجە، ئەمین ڕەواندزی، ڕەئوف جەلالی، بەشیر مشیر، مەحمود جەوددەت، عەلی عیرفان و کەسانی تر).

له شۆڕشی بیستدا هۆزی داودە بەسەرۆکایەتی (ڕفعەتی سمایل بەگ) لەگەڵ برایم خان قسەیان کرد بەیەك و ناوچەی دوزی لە چنگ بەریتانیا دەرهێنا و نزیکەی مانگێ فەرمانڕەواییان تیادا کرد، لە لاپەڕەکانی داهاتوودا بەدوور و درێژی ئەمەتان ئەخرێتە بەرچاو.

**هۆزی زەنگەنە:**

لەهۆزە هەرە کۆنەکانی کوردە و لە (شەرەفنامە)دا[٤٦] ناوی هاتووە، چەند تیرەیەکی ئەم هۆزە کەتوونەتە (قەوقاس و خۆراسان و ئەوغانستان)، هەروەها لقێکی کە بریتیە لە هەزار و پێنج سەد خێزانێ لە هەرێمی (کرماشان)دا نیشتەجێن، لە کوردستانی عیراقیشدا ئەم هۆزە نزیکەی (١٥٠٠) خێزان ئەبن و بەکشتوکاڵەوە خەریکن و لەدەوروپشتی (برایم خانچی)[٤٧] و (سماق)دا[٤٨] نیشتەجێن. هۆزی زەنگەنە لەم دێهاتانەدا بڵاوبونەتەوە (مەلا هۆمەر، گەڕاوی،

عەلیاوە، شاه نەزەر، كانی عوبێد، توكن، گۆبان، دوانزدە ئیمام، قەرەبلاغ، قولیجان، رەحیم وەرقە، تەپە عەلی، خدران، قوببە، شێخ لەنگەر)[٤٩]، ئەم گوندانەش سەر بەناحیەكانی (پێواز، قەرەتەپە، سەرقەلا، قادر كەرەم)ن.

لە سەردەمی فەرمانڕەوای باباندا ناوی ئەم هۆزە چەند جارێك هاتووە (خان ئەحمەد خان كوڕی میر سمایل ١١٠٠ – ١١٧٠)ی كۆچی سەرۆكی ئەم هۆزە میرنشینێكی لە (قەیتول) داناوە و (قەرەداغ و سەنگاو)ی لە فەرمانڕەوای بابان پچڕاندووە و چاوی بڕیوەتە (بازیان) لەلایەكی تریشەوە پەلی هاویشتوەتە دۆڵی (تانجەڕۆ) و (شارەزوور) لەبەر ئەمە (خانە پاشای بابان) بەسوپایەكی بەهێزەوە هەڵی كوتاوەتە سەر ئەم هۆزە و تەنگی پێ هەڵچنیوە تا لە دەوروبەری ١١٣٤ك – ١٧١٢زدا ناچاری كشانەوەی كردوون، ئاغەكانی زەنگەنە پشتاوپشت ئەچنەوە سەر میر ئیسماعیلی گەورە، لە ساڵی ١٩٢٢دا (حەمە كەریم ئاغا) كرا بە بەڕێوەبەری ئاسایش لە ٣٥ گوندی ئەو ناوچەیە.

درەختی رەگی ئاغاكانی زەنگەنە



له شۆڕشی برایم خاندا هۆزی زەنگەنە هەڵوێستێکی یەکلایەنیان نەبووە، لەکاتێکدا (عبدالکریمی وادی ئاغا) کە گوندی (زەرداو)ی بەدەست بووە لەگەڵ شێخ وەهابی تاڵەبانی دژی ئەو شۆڕشە بوون (عەلی حەسەن ئاغا) کە لە دوانزدە نیمامدابوو دژی شۆڕش نەبوو، چونکە عەلی ئاغا و برایم خان هەردووکیان لەم ناوچەیەدا سەر بە شێخ مەحمود بوون، عەلی ئاغا لەکاتی فەرمانڕەوای شێخ مەحمود لە ساڵی ١٩٢٢دا بوو بە یەکێك لە یاوەرانی شێخ.

**بنەماڵەی تاڵەبانی:**

ئەم بنەماڵەیە لەبنچینەدا ئەچنەوە سەر هۆزی (زەنگەنە)، باپیرە گەورەی ئەم بنەماڵەیە (مەلا مەحمودی زەنگەنە) کچی میر سمایلی زەنگەنەی هێناوە و شێخ ئەحمەدی کوڕیان ئەچێتە گوندی (تاڵەبان)[٥٠] لەوێ دائەنیشێت و ناوی گوندەکەیان بەسەردا ئەسەپێت، شێخ ئەحمەد نۆ کوڕی ئەبێت لەوانیشەوە کوڕو کوڕەزایەکی زۆریان لێ ئەکەوێتەوە (شێخ غەفور)یان ئەچێتە (کۆیە) و (شێخ محمد عارف)یش ئەچێتە (زەرداو) و (شێخ عزیز)یش ئەچێتە بنار گل و (شێخ ئەورەحمان)یش لە کەرکوکدا نیشتەجێ ئەبێت.

شێخ عزیز لە بنار گلدا تەکیەیەك دروست ئەکات و دەست ئەکاتە ئیرشاد لەسەر ڕێڕەوی (قادری) و زۆربەی جوتیارانی ئەو ناوچەیە لەدەور کۆ ئەبنەوە پاش خۆی (شێخ حەمید)ی کوڕی لە تەکیە لەجێی دائەنیشێت و نەوتی گل ئەگرێتە دەست، شێخ حەمید لە تاقی لاوێتیەوە ئازا و بزێو و زیرەك و چاوی لە گەورەیی بووە دەست ئەداتە ئەرز پەیدا کردن و بشێوی ئەخاتە ناو جوتیارەکانی هەرێمی گلەوە و (عەزیز بەگی) گلی لەو ناوەدا ئەکوژرێ شێخ حەمید بە بیانووی کوژاندنەوەی ئاژاوە لە کەرکوکەوە هێزێکی سوارە ئەهێنێت و هەشت مانگ ئەو هێزە بەر ئەبنە سەر و پۆتلاکی دانیشتوانی گل تا وایان بێزار ئەکەن گوندەکانیان بەجێبهێڵن و روو بکەنە کەرکوك[٥١] کە پیاوە ئازا و دەم راسەکان گلیان بەجێهێشت[٥٢] ئەو ناوچەیە بەیەکجار بۆ (شێخ حەمید) تەخت بووەوە تا وەهای

لێهات شێخ حەمید لە ساڵی ١٩١٨دا یەکەم کەس بوو لە پارێزگای کەرکوك کە خاوەن هێزێکی پتەو و بوو بە دوژمنی عوسمانی و دۆستی یەکەمی سوپای بەریتانی بوو هەرچی توانای هەبوو لە پێناوی بەریتانیادا سەرف کرد و بەرامبەر ئەو خزمەتە ئەوانیش سەربەستیان دایێ بەکەیفی خۆی گوندەکانی ناوچەی (گل)ی بەڕێوە ببات و بیرە نەوتەکانی ئەو ناوچەیە بەکاربهێنێت، ئەدموندسن ئەڵێت: ئەم پیاوە پیرە ساڵی ١٩٢١ کۆچی دوایی کرد و چاوم پێ نەکەوت، هەموو کوڕەکانی شێخ حەمید شۆخ و شەنگن هەمووشیان لەگەڵ بەڕێوەبەرایەتیدان، چەند بەرەبابێکی ئەم بنەماڵەیە لە ناوچەی قەرە حەسەن و داقوقدا نیشتەجێن[٥٣]. لە بنەماڵەی تاڵەبانی شێخ رەزای شاعیر (١٨٣٥ – ١٩١٠) هەڵکەوتووە. شێخ رەزا چووەتە ئەستەمۆڵ و لەوێ هەشت ساڵ لە سایەی (کامل پاشا)ی گەورەدا ماوەتەوە، دوو ساڵیش لە میسر دەرسی فارسی بە کوڕەکانی خدێوی ووتوە. لەوێوە گەڕاوەتەوە ئەستەمۆڵ و چووەتە ماڵی خوا بۆ حەج ئینجا گەڕاوەتەوە کەرکوك و دوا ساڵەکانی ژیانی لە بەغداد رابواردووە و لەوێ کۆچی دوایی کردووە و لەمەزارگەی (عبدالقادر گەیلانی)دا بەخاك سپێردراوە.

**هۆزی (گێژ):**

گێژ لە نەوەی ئەو (کاژ)انەن کە لە شەرەفنامەدا ناویان هاتووە جاران لە شیروانە و کەلار و سەید خەلیلدا بوون، کە جاف لەسەردا هاتوونەتە خوارێ گێژەکان بەرگەی ئەو شەپۆڵەیان نەگرتووە و کشاونەتەوە تا گەیشتونەتە سەر رووباری (نارێن)ی ناوچەی قەرەتەپە و ئەو ناوەیان ئاوەدان کردووەتەوە، گێژەکان بەکشتوکاڵەوە خەریکن و سەربزێو نین. ئەم هۆزە لق و پۆی ئەوتۆی نییە ئەوە نەبێت بەشێکیان لە مێژە چوونەتە ناوچەی (بادمان)ی سەر بەقەزای (ئاکرێ) و بوونەتە بەشێك لە (عشائر السبعة)ی ئەو ناوچەیە، مێژووی کورد و کوردستان ژمارەی ئەم هۆزەی بە ٣٠٠ خێزانێك داناوە و لەم گوندانە ئەژین (نارێن، سەیدەلان، چنچاڵ، عەین شکور لاوە)[٥٤].

لەنێوان گێژ و دەلۆدا ژن و ژن خوازی و هاوسنووری هەبووە، هەرچەندە گێژەکان بە ئاشکرا نەیانتوانیووە لە ڕیزی شۆڕشی برایم خاندا بوەستن، بەڵام بەنهێنی یارمەتی بەشێك لە دەلۆییەکانیان داوە.

**هۆزی ( بەیات ):**

هۆزێکی تێکەڵاوە لە عەرەب و تورکمان، دێهاتەکانیان سەر بەقەزای دوزخورماتووەوە ئەکەونە سەر ڕێگەی ئۆتۆمبێلی نێوان (حەمرین و دوز)ەوە، ئەم هۆزە ئەکرێنە ئەم تیرە و لقانەوە (ئەلبو عەلی، ئەلبو حەسەن، ئەلبو حسێن، ئەلبو والی، عومەرلی، بەسطاملی، خەصە دەرلی، یەلاَنچی، قوشچی) (فارس بەگی کوڕی حاجی محمد بەگ) یەکێك بووە لە سەرکردەکانی ئەم هۆزە و لە ئاوایی (بەسطاملی)دا دانیشتووە. کلۆدیۆس (ریچ) لە گەشتەکەیدا کە بەناو ئەو هۆزەدا تێپەڕیوە نووسیویە ئەڵێ ٢٨ی نیسانی ١٨٢٠: سەعات هەشت و بیست دەقیقە گەیشتینە چەمە وشکەکەی (قوڕی چای)[٥٥] لەو ناوە خێوەتگایەکی تورکمانی بەیاتم بینی (حەسەن)ی سەرۆکی ئەم هۆزە داوای لێ کردم نیوەڕۆژەی لەگەڵ بکەم، پیاوێکی رووخۆش بوو ریشێکی سپی جوانی هەبوو، زیرەك و قسەزان بوو ئەتوت لە کۆشکی رۆژهەلاتیدا گەورە بووبێت وەها بوو، بۆی گێڕامەوە سوڵتانی عوسمانی بێ پارە ئەم هەرێمەی بەبەیات بەخشیووە بەرامبەر ئەوەی لەشەڕدا یارمەتی والی بەغداد بدەن، ووتی لەکاتی پێویستدا ئەتوانین هەزار سوار لە هۆزەکەیان کۆبکەنەوە)[٥٦].

هۆزی بەیات لەگەڵ هۆزی داودەدا ڕێکەوتن و لەساڵی بیستدا دوزخورماتوویان لە چنگ سوپای بەریتانی دەرکرد و فەرمانڕەواییان تیادا کرد، سەرەنجام شۆڕشەکەیان تێکشکا و زەرەر و زیانێکی زۆریان کرد و ئەمەش لە لاپەڕەکانی داهاتوودا بەرچاو ئەکەوێت.

**هۆزی ( لهێب ):**

هۆزێکی عەرەبە ئەچێتەوە سەر هۆزی (جبور) ئەویش ئەچێتەوە سەر (زبید) لهێب نەوەی (محمد کوڕی جەبر)ن، لە لهێبەوە چەند تیرەیەك بووەتەوە هەندێکیان لەسەر رووباری (نارێن) نیشتەجێ بوون سەرۆکیان (رشید هندی)یە[٥٧].

لهێب لەگەڵ هۆزی دەلۆ هاوسنوور بوون و پەیوەندی دراوسێتی و ژن و ژن خوازیان لەناودا هەیە، لەکاتی شۆڕشی برایم خاندا پشتگیریان کردن.

**هۆزی ( عەززە ):**

هۆزێکی گەورە و ناسراوی عەرەبە ئەچێتەوە سەر (زبید الأصغر)، لە پارێزگاکانی (دیالە، بەغداد، موسڵ، بابل، رەمادی) بڵاوەبوونەتەوە، لە سەرەنجامی شەڕ و شۆڕی نێوان رۆم و عەجەم ئەم هۆزە پەرت و بڵاوبوونەتەوە. سەرکردەکانی ئەم هۆزە ئەچنەوە سەر بەگزادەکانی (سامەڕا) ئەم هۆزە لە شۆڕشی بیستدا بەشداریان کرد و قەزای (خالص – دڵتاوە)یان لەچنگ داگیرکەر دەرکرد و ماوەیەك حوکمڕانیان تیادا کرد ئەو حەلە دوو سەرکردەی بەناوبانگیان هەبوو (عەلی کوڕی لەطیف کوڕی خەڵەف عەصیب کوڕی حاجی فارس) و (حەبیب کوڕی خەیزەران[٥٨] کوڕی عبداللە کوڕی محمد کوڕی مروەح کوڕی حاجی فارس) واتە باپیرە گەورەیان ئەچێتەوە سەریەك.

کە شۆڕشەکەیان تێکشکا سوپای بەریتانی پەلاماری ئەم هۆزەیدا ئەمانیش کشانەوە چیای (حەمرین) لەوێ لەگەڵ شۆڕشگێڕانی (دەلۆ) یەکیان گرت و نزیکەی ساڵێك پێکەوە لە هەردوو دۆڵەکانی ئەو ناوچەیە ژیان.

پاش ئەوەی زانیارییەکمان دەربارەی دەلۆ و هۆزەکانی ناوچەی دوز و کفری پێشکەش کردن ئیتر کاتی ئەوە هاتووە بچینە ناو جەرگەی شۆڕشەکە خۆیەوە.

## پەراوێزەکانی بەشی سێیەم:

١- (ڤ. ف. مینۆرسکی ١٨٧٧ – ١٩٦٠) لە روسیا لەدایك بووە و لە لەندەن مردووە، ساڵانی (١٩٠٤ – ١٩٠٨) راوێژکەری –مستشار- باڵیۆزخانەی رووس بووە لە تاران و تەورێز، چەند جارێك بەکوردستاندا گەڕاوە، پاش شۆڕشی ئۆکتۆبەر وازی لە سیاسەت هێناوە و لە دانشگای پاریس بووەتە مامۆستا، لە ساڵی ١٩٣٢دا چووەتە لەندەن تا ساڵی ١٩٤٤ لە دانشگای کامبردج سەرۆکی بەشی ئێرانی بووە، لە چەند کۆنگرەیەکی ناو دەوڵەتاندا بەشداری کردووە، مینۆرسکی لەسەر کورد کتێبی (الأكراد ملاحظات وانطبات)ی داناوە، (د. مارف خەزنەدار) کردوویەتیە عەرەبی و لە ساڵی ١٩٦٨دا چاپی کردووە، لەم دواییەدا (حمە سعید حمە کریم) لە عەرەبیەوە کردوویەتیە کوردی ئێمە پشتمان بەعەرەبییەکەی بەستووە.

٢- بڕوانە سەرچاوەی پێشوو (ل ٣٥).

٣- (أ. شامیلۆف – ئەرەب شامیلۆف) ساڵی ١٨٩٧ لە شاری (قارص) لەدایك بووە، لە کوردە یەزیدیەکانی یەکێتی سۆڤیەتە، چەند ساڵێك رۆژنامەی (ریاتازە)ی کوردی لە ئەرمەنستان سۆڤیەت بڵاوکردووەتەوە، چەند کتێبێکی بەکوردی و رووسی چاپ کردووە. (د. کەمال مەزهەر ئەحمەد) کتێبی (حول مسألة الاقطاع بين الكرد)ی لە رووسیەوە کردووەتە عەرەبی و ساڵی ١٩٧٧دا چاپی کردووە.

٤- بڕوانە (حول مسألة الاقطاع) ل٦٣.

٥- سەرچاوەی پێشوو، ل٦٤

٦- سەرچاوەی پێشوو، ل٦٨.

٧- (س –أ- یگیزارۆف) یەکێکە لە ئەرمەنیە ئەتنوغرافیە زانا و بەناوبانگەکانی نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم. پەیوەندی لەگەڵ کورد پتەو بووە و زمانی کوردی بەباشی زانیوە، بەهاوکاری کردن لەگەڵ

(زاغۆرسكی) فەرهەنگێکی (رووسی – کرمانجی) و (کرمانجی – رووسی) لە ساڵی ١٨٩١دا لەچاپداوە.

٨- بڕوانە کتێبی (مع الأكراد) – تۆمابوا، وەرگێڕی بەعەرەبی (ئاواز زەنگەنە) چ ١٩٧٥، ل٤٠.

٩- بڕوانە – مێژووی کورد و کوردستان، وەرگێڕی بەعەرەبی (محمد علی عونی) چ ٢ ١٩٦١، ل٣٥٥ – ٤٤٤.

١٠- بڕوانە کتێبی (ملاحظات عن عشائر كردستان الجنوبية) وەرگێڕی لە ئینگلیزیەوە بۆ عەرەبی (فوئاد حەمە خورشید) چاپی ١٩٧٩.

١١- (لۆ) واتە (چین) – (دەلۆ – دە چین) هۆزی دەلۆ بریتیە لە (دە، لۆ) واتە (دە تیرە).

١٢- (سەنگاو) ناوچەیەکە سەر بەقەزای (چەمچەماڵ)ی پارێزگای (سلێمانی) و کەوتووەتە باشووری شاری چەمچەماڵەوە.

١٣- وەك (رەزا ئەمین دەلۆیی) لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٧٣ ئەو رووداوەی بۆ گێڕامەوە، (رەزا کە بەرەزا بەگ) ناسراوە سی ساڵ قومسێر –مفوض- بووە، رۆشنبیرێکی نەبەرد و چالاك و خزم دۆست بووە، ساڵی ١٩٧٥ کۆچی دوایی کرد.

١٤- ئەم کارەساتە لە دەوروبەری ساڵانی (١٨٥٧ – ١٨٥٨) روویداوە.

١٥- (عبدالله کوڕی یوسفی کوڕی ئەوڕەحمان) چووەتە کەرکوك، (عبدالله) سێ کوڕی هەبووە (فتح الله، وەهاب، عبدالرحمن) یوسفیش دوو کوڕی هەبووە (الله وێردی و سلێمان)، (الله وێردی)یش دوو کوڕی هەبووە (ئەورەحمان و تەحسین)، کاك ئەوڕەحمانیش سێ کوڕی هەبووە (بورهان و تەحسین و ناهید) (سلێمان)ی برایشی سێ کوڕی هەیە (صلاح و سەردار و بهاء)، لەو ساڵانەی لە کەرکوك بووم (١٩٤٩ - ١٩٦١) لەگەڵ ئەم بنەماڵەیە لە (الله وێردی) و بەرەو خوارەوە ئاشنایەتیم لەگەڵیاندا هەبووە.

١٦- (رۆستەم) ئەم کوڕانەی هەیە (محمد و جەبار و صلاح و نورالدین و ستار و جەمال) گەورەکەیان (محمد پیرۆز) ئێستا ئەمینداری گشتی پەروەردەیە لە هەرێمی کوردستاندا هەروەها (رۆستەم)ێکی دیکەش لە کەرکوکدا هەبوو لە نەسڵا دەلۆی سەر قەڵا بوو، ئێستا کوڕ و کوڕەزاکانی لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکان.

١٧- ساڵی ١٩٥٢ بۆ تەخمینی (ئەوقاف – عوقر) چوومە ئەم ئاوایيە و گفتوگۆم لەگەڵ کردن وایان دەرئەبڕی هەشتا ساڵێك ئەبێت ئەم ئاوایيەیان ئاوەدان کردووەتەوە.

١٨ ئەم صالحە هەر ئەو (صالح دەلۆ)یە کە لەشوێنێکی دیکەدا باسمان لێوەکرد و لە سلێمانی نیشتەجێ بووە.

١٩- قادر بەگی بابان یەکەم بابان بووە کە لە کفری دانیشتووە و رەگی تیادا کوتاوە قادر بەگ وەك باب و باپیرانی هۆزی دەلۆی لە دەوری خۆی کۆ کردووەتەوە و ئەوانیش بۆی بوونەتە پاڵپشتێکی دڵسۆز. پاش مردنی قادر بەگ (مەجید پاشا)ی کوڕی هەمان دەوری بینیووە.

٢٠- (نارێن) ئاوایيەکە کەوتووەتە سەرچەمی (نارێن)ی سەر بەناحیەی (قەرەتەپە)ی قەزای (کفری)، ئەم ئاوایيە کەوتووەتە نێوان برایم سەمین و قەرەتەپەوە، ئەوسا دەلۆیی تیادا بوو ئێستا زۆربەی دانیشتووانی لەهۆزی (گێژ)ن.

٢١- لەوانەی کە لەگەڵ خورشید بەگدا کردیانە ئەوبەری سیروان و لەناوچەی خانەقیدا نیشتەجێ بوون ئەمانەبوون (فتح الله بەگی کوڕی ئەحمەد بەگ، جەوهەر عەباس، ئەحمەد وەلی) و کەسانی تر بوون.

٢٢- ئەوانەی لە پێشدا چووبوونە ناوچەی خانەقی کوڕەکانی شاعیری بەناوبانگ (حەسەن کەنۆش) بوون لەوبەر سیروان ئاوایی (مەی خاس)یان ئاوەدان کردەوە ئەوەندەی پێ نەچوو ئاوایی (پەڵگانە)شیان

دروست کرد، کوڕانی حەسەن کەنۆش (فەقێ ئیسماعیل و ئەمینی) برای بوون، فەقێ ئیسماعیل سێ کوڕی هەبوو (محمد و ئەحمەد و حسین) و ئەمینی برایشی دوو کوڕی هەبوو (یاوەر و خوسرەو)، ئەم زانیارییەم لە رۆژی ١٩٨٠/٦/٧ لە خانەقی لە (ماوزەری کوڕی محمدی کوڕی فەقێ ئیسماعیلی کوڕی حسن کەنۆش) وەرگرت پێی گوتم کە (حەسەن کەنۆش کوڕی محمد کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەسەن کەنۆشی گەورەیە)، لەماڵ یەکێك لەوەچەکانی (حەسەن کەنۆش) لەخانەقی پارچە مەڕمەڕێکی بچووکم بینی رەگی ئەم بنەماڵەی لەسەر هەڵکەندرابوو مێژووی (١١٠٠ و ١٣٠٠)ی کۆچی لەسەر نووسرابوو.

٢٣. لەوانە (دێی کانی ماسی) نزیکەی بیست کیلۆمەترە کەوتووەتە رۆژهەڵاتی باشووری خانەقییەوە و بەدەست فتح الله بەگەوە بووە (نەوت خانە) بە ٣٥ کیلۆمەترە کەوتووەتە رۆژهەڵاتی باشووری خانەقیەوە و بەدەست عبدالعزیز خورشید بەگەوە بووە (پەلکانە) بەدەست ماوزەرەوە بووە (پیکە) بەدەست عبدالله ئەمین دەلۆییەوە بووە (کانی بز) بەدەست کەریم ئەمینەوە بووە (عەین هلال) بەدەست رەزا ئەمینەوە بووە (جەبراوا) بەدەست عبدالله بەگی برای فتح الله بەگەوە بووە، لەهەر گوندێ لەم گوندانەدا نزیکەی بیست تا حەفتا خێزانێك هەبووە جگە لەکانی ماسی کە نزیکەی سەد خێزانێکی تیادا بووە.

٢٤- لەناو شاری کفریشدا نزیکەی سەد و بیست خێزانی دەلۆیی هەیە.

٢٥- دەلۆی ئەم بەری سیروان —واتە ناوچەی کفری- بەدەلۆکانی ناوچەی خانەقی ئەڵێن (دەلۆی ئەو بەری سیروان)یان (دەلۆی ئەوبەری) ئەوانیش بەمان هەروا ئەڵێن.

٢٦- (خان) کورت کراوەی (خاقان)ە و لە بنچینەدا وشەیەکی مەغۆڵیە.

٢٧- بڕوانه –گۆڤاری (دەنگی گێتی تازە) ژمارە (٨) ساڵ (٣) ١٩٤٥ (ج. ب. ر). واته (جەمیل بەندی ڕۆژبەیانی).

٢٨- (دەنگی گێتی تازە) ژمارە (دەی)ی ساڵی سێ ١٩٤٦، (ج. ب. ر).

٢٩- (جاف) لەسەرەتادا وەك وشەیەك (جاڤان – جاوان) بووە، ئینجا بووەتە (جاڤان) و (جاف) – بڕوانە: گۆڤاری (کاروان) ژمارە (٢١) ساڵی ١٩٨٤، محمد جمیل ڕۆژبەیانی.

٣٠- هەرێمی (جوانڕۆ) ئەکەوێتە نێوان (هەڵەبجە) و (کرمانشان)ەوە.

٣١- بڕوانە ژمارە یەکی گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد ساڵی ١٩٧٤ ٣٧٣، د. ناجی عەباس.

٣٢- مەزارگەی (سەید خەلیل) کە سەد ساڵێکە مەزارگەی جافە پڕە لە مەزاری گەورەکانی (زەند و گێژ و پالانی) و ئێستاش تاکە تاکە شوێنەواری ئەو هۆزانە لە شاکەل و شیروانەدا ماون، بەڵام وەك هۆزێك کۆچیان کردووەتە ناوچەی زەنگابات و چێمەن و نارێن.

٣٣- بڕوانە (تأريخ العشائر الكردية)ی عەباس عەزاوی چ ١٩٤٧، ل٣٩.

٣٤- لەسەردەمی عوسمانیدا دەوڵەت سێ جۆرە پلەی (پاشا)یەتی هەبووە، (یەکەمیان) بەخشراوەتە سەرکردەکانی سوپا و والی ولایەتە گەورەکان (دووەمیان) دراوەتە هەندێ موتەسەرف و قایمقام (سێیەمیان) بەخشراوەتە سەرۆکی ئەو هۆزانەی پەیوەندیان لەگەڵ دەوڵەت پتەو بووە، لەموناسەباتدا پاشا جلی ڕەسمی لەبەر ئەکرد و فێستی لەسەر ئەنا، هەر پاشایەکیش مووچە و بەراتی خۆی هەبووە.

٣٥- (بیجار، سەقز، سنە، بانە، مەریوان) کەوتبوونە ناو خاکی ئێرانەوە، ئەو دوایی شوێنەکانی لەناو خاکی دەوڵەتی عوسمانیدا کە ئێستا عیراقی خۆمانە.

٣٦- بڕوانە —الأكراد، ملاحظات وانطباعات، باسيل نيتين، وەرگێڕی بۆ عەرەبی، د. مارف خەزنەدار. ١٩٦٨، ل١٦٦ — ١٦٧.

٣٧- بڕوانە، گۆڤاری زانیاری کورد، ژمارە یەك، د. ناجی عەباس، ل٢٧٣.

٣٨- بڕوانە. خولاصەی مێژووی کورد و کوردستان، محمد ئەمین زەکی، وەرگێڕی بەعەرەبی، محمد علی عونی، چ دووەم، بەغداد ١٩٦١، ل٣٨١ — ٣٨٢.

٣٩- گردی شیروانە شوێنەواری ساسانەکانە، قەڵا دروست کراوە کە سێ نهۆمە، (٢٤) ژووری تیادا بووە و لەهەر چوارلاوە شوێنی پاسەوان و یاساوڵی بۆ کراوە. لە قەڵاکانی سەدەی ناوەندی ئەوروپا ئەچێت. لە سیەکانەوە ئەو قەڵایە تەرك کراوە، هەر بۆ ئەوە ئەشێت دایەرەی ئاسار کەڵکی لێ وەربگرێت و بایەخی بدرێتێ.

٤٠- تا ئێستا بەو شوێنە ئەڵێن (پاشا کوژراو) کەوتووەتە نزیك دێی (سەرچەم) کە ئەویش بە دە کیلۆمەترەیەك لەخوار کفریەوەیە.

٤١- بڕوانە (مێژووی سلێمانی)، محمد ئەمین زەکی، وەرگێڕی عەرەبی مەلا جەمیل رۆژبەیانی ١٩٥١، ل١٨٣.

٤٢- (دەنگی گێتی تازە) کانونی دووەمی ١٩٤٦ (ج. ب. ر).

٤٣- مەحاك، مەحمودی کوڕی وەستا ئەحمەدی کوڕی دارشاڵە، نازناوی (فنونی) بووە لەرەگەزدا دەچێتەوە سەر هۆزی زەند، لەناو داودە دانیشتووە، ساڵی ١٢٩٥ی کۆچی لە ئاوایی (وارانی) کۆچی دوایی کردووە.

٤٤- (الداودية ماضيها وحاضرها) نووسینی (د. غالب الداودی) نجف ١٩٥١، ل١٦ و ١٢٠.

٤٥- (حەمە خورشید) نەك هەر جەنگاوەر بەڵکو شاعیر و رۆشنبیری سەردەمی خۆی بووە، خزمەکانی داوایان لێ کرد بگەڕێتەوە

چونکە دەوڵەتی عوسمانی لێی خۆش بووە، ئەویش بەم شیعرە وەڵامی دانەوە:

هەوای (هەواسان) (خوڕخوڕە) و (سەرتاف)

خاسترەن جە نزیك رۆمی بیٚ ئینصاف

(هەواسان و خوڕخوڕە و سەرتاف) سیٚ شوێنی ناساز بوون لەناو چیای بەمۆدا، حەمە خورشید ئەو شوێنەی لە نزیك بوونی لە عوسمانیەکان پیٚ خۆشتر بووە ساڵی ١٩١٨ حەمە خورشید گەڕایەوە لە دەورویشتی ١٩٢٥دا کۆچی دوایی کرد.

٤٦- بڕوانە (شەرەفنامە) وەرگێڕی —هەژار- چ ١٩٧٣، ل٤٢٣ — ٤٣١.

٤٧- برایم خانچی — باپیرە گەورەی ئاغاکانی ئەم بەرەبابەیە، لە ڕێی کاروانی سلێمانی — بەغداد لەنێوان سەرقەڵا و سەنگاودا کاروانسەرایەکی گەورەی دروست کرد، لەوکاتەوە ئاوایی و خانەکەش بەناو (برایم خانچی)یەوە ناوبانگیان دەرکرد.

٤٨- بڕوانە، مێژووی کورد و کوردستان بەعەرەبی، چ ١٩٦١، ل٣٦٩، ٣٧٨، ٤٣٠.

٤٩- بڕوانە، تاريخ العشائر الكردية، عەباس عەزاوی، ١٩٤٧، ل١٧٥.

٥٠- (تاڵەبان) گوندێکە سەر بەقەزای (چەمچەماڵ) و کەوتووەتە سەر ئەودیوی ڕووباری (باسەڕە)وە.

٥١- لەوانەی ڕایان کرد و لە کەرکوك نیشتەجیٚ بوون (شەریف عومەر جەلال، مەحمود سعدالله، عەلی شەریف، ئیبراهیم شاستان) بوون.

٥٢- (حەمە عەلی بەگی پەریزاد) کە یەکێك بوو لەناودارەکانی ناوچەی (گل) و لەکەرکوك دائەنیشت کاغەزێکی دوور و درێژی لەم بابەتەوە بۆ نووسیم هەروەها خۆیشی چاوی پێمکەوت جگە لەمەش (مەلا مەجیدی گلی)یش زۆری لەم بابەتەوە بۆ گێڕامەتەوە، ئەم دوو بەگزادە گلیە ئاوارە

بووانه جەژنی رەمەزانی رێکەوتی حوزەیرانی ساڵی ١٩٨٤ پێکەوە لە کارەساتی وەرگەڕانی ئۆتۆمبێلەکەیاندا ئەمری خوایان بەجێهێنا.

٥٣- بڕوانە: کورد و تورك و عەرەب، چ ١٩٧١، ل٢٤٦، ٢٥٣.

٥٤- مێژووی کورد و کوردستان و تأريخ العشائر الكردية، عباس عەززاوی، ل٦١.

٥٥- (قوری چای) تورکیە واتە (چەمە وشك) ئەم چەمە لە هاویندا وشکە و لەزستاندا ئاوی لافاوی چیاکانی پیادا دێتە خوارێ، کەوتووەتە نێوان سلێمان بەگ و کفریەوە.

٥٦- بڕوانە: گەشتەکەی ریچ بەعەرەبی چ ١٩٥١، ل١٨٠.

٥٧- بڕوانە – عشائر العراق العربية، عباس العزاوی ١٩٥٥، ل٣٣ و ٧٣.

٥٨- (حەبیب خەیزەران) پیاوێکی زیرەکی چاوتێر بوو لەساڵی ١٩٨١دا کۆچی دوایی کرد.

## بەشی چوارەم
## چوونە ناوجەرگەی شۆڕشەوە

کە سوپای بەریتانی سەرتاپای خاکی دەستە چەپی رووباری سیروانی داگیر کرد، ویستیان لە سیروان بدەن و هێرش بەرنە سەر بنکەکانی سوپای تورك کە لەدەستە راستی سیروان بوون فەرماندەی هێزی ژمارە سیانزدەی تیپی شەشەمی ئەو هێزە شەوی ٣/٤ی کانونی یەکەمی ١٩١٧ کشایەوە شوێنێکی نوێ لە باکووری قەرەتەپە)، هەر ئەو شەوە سوپای بەریتانیا پردێکیان دروست کرد و پەڕینەوە ئەوبەری سیروان لەبەرئەوەی تورکەکان ئەو پێدەشتەیان بەلافاو نقوم کردبوو، جموجۆڵی سوپای بەریتانیایان پێ دواخست بەچەشنێك تا چواری مانگ نەیانتوانی لە پردی (نارێن) بگەنە ئەوبەر. جەنەراڵ (نیگرتن)ی فەرماندەی هێزی ژمارە سێی بەریتانیا لەبەرەبەیانی رۆژی پێنجی مانگدا فەرمانی هێرش بردنیدا بەدوو بەتالیۆن و کەتیبەیەك سوارە و چوار مودەرەعە هێرشیان بردە سەر سوپای تورك کە بەدوو میل لە باکووری (قەرەتەپە)وە دوور بوون، شەڕ چوار رۆژ(١) لەنێوان هەردوو سوپا لەو ناوچەیە دەوامی کرد، لەم شەڕەدا (٢٣٠) کەس لە سوپای بەریتانیا و (٥٠٠) کەسیش لە سوپای تورك کوژرا و (٢٢٥) کەسیشیان لێ بەدیل گیرا، بۆ هێزەکانی بەریتانیا دەرکەوت لەمەولا هەروا بەئاسانی و بێ زەرەر و زیان ناتوانن بەرەو پێشەوە تەکان بدەن لەبەر ئەمە رۆژی حەوتی کانون لە قەرەتەپە کشانەوە و لە سیروانیش پەڕینەوە دیوی خۆیان، دوابەدوای ئەوان سوپای تورك رۆژی نۆی کانون قەرەتەپەیان گرتەوە[٢].

سوپای بەریتانیا هێزەکانی خۆیان کۆکردەوە و ریزی خۆیان رێکخست و بەهێزێکی گەورەوە جارێکی تر لە سیروان پەڕینەوە، سوپای تورك ئەمجارە بەرەنگاریان پێ نەکرا بەرەو دوا کشانەوە، مەیدان بۆ ئینگلیزەکان چۆڵ بوو، هۆزەکانی ئەو ناوچەیە بەهاتنەوەی بەریتانیایان پێ ناخۆش بوو هەندێکیان

بڕیاری بەرەنگاری کردنی ئەو سوپا گەورەیاندا، لەکاتێکدا سوپای تورك خۆی بۆ ڕانەنەگیرا لە دەوروپشتی گوندی (فەککە)ی لای (برایم سەمین) دوو چەکداری دەلۆ و یەکێکی گێژ[٢] قسەیان کرد بەیەك و دەستڕێژێکیان لە مودەرەعەیەکی ئینگلیز کرد، ئەوانیش لێیان هاتنە دەس (حسین کاکەمند)یان لێ کوژرا، ئەمە یەکەم شەهیدی دەلۆییە کە سوپای بەریتانی خوێنیان ڕژاند, تەرمی شەهید لە مەزارگەی (برایم سەمین) بەخاك سپێردرا, سوپای بەریتانیاش بێ ئەوەی تورکێك بەرەنگارییان بکات تەکانیاندا ڕۆژی ١٩١٨/٨/٢٤ شاری کفرییان داگیر کرد. ساڵێك بوو بە هۆی شەڕی نێوان تورك و ئینگلیز ڕێگەی بەغداد لەم شارە و لە هەموو کوردستان بڕابوو, زستانی ئەم ساڵەش بێ باران بوو, ئازوقە زۆر کەم بوو و گرانیەك سەری هەڵدابوو, سوپای بەریتانی هەستیان بەمە کردبوو هاتن بۆ دلنیا کردنی ئەو خەڵکە چەند ڕۆژێك لەسەریەك سەمۆنیان بەسەر ئەو خەڵکەدا دابەش کرد تا چەند ڕۆژێك لەوەوپاش ڕێگەی بەغداد کرایەوە و بازرگانی جوڵایەوە ئامشۆکردن دەستی پێ کردەوە کاروان لە سلێمانیەوە بەرەو خواربووەوە.

لە سەرەتای ساڵی ١٩٢٠ حکومەتی بەریتانیای داگیرکەر هێڵی شەمەندەفەری گەیاندە ئاوایی (کنگربان) کە بە دوانزدە کیلۆمەترە ئەکەوێتە ڕۆژئاوای کفریەوە تا سێ ساڵ ئەو هێڵە لە کنگربان بەرەو کەرکوك تێ نەپەڕی، لەبەرئەوە کفری و ئێستگەی ئەو گوندە بوو بەدەرگایەکی سەرەکی بۆ کاروانی کەرکوك و هەولێر سلێمانی، دانیشتووانی کوردستان کە بەرەو بەغدا برۆیشتنایە ئەوا ئەهاتنە کفری و باروبار خانەیان ئەخست لەوێوە سەعاتە ڕێیەك بەسواری ئەچوونە ئێستگەی (کنگربان) ئەو شەوەیان لە شەمەندەفەر ئەبردە سەر بۆ ڕۆژی دووەم لەگەڵ گزنگی هەتاو کەوتندا لە بەغدا بوون، بەمە ڕێگەی چوار ڕۆژیان بوو بەچوار پێنج سەعاتێکی ناو قەتار.

پاش ئەوەی ئینگلیزەکان کفریان داگیر کرد، سەربازگەیەکیان نێوان گردی (ئەسکی کفری) و ئاوایی (کنگربان) دروست کرد و هێزە سەرەکیەکەیان تیادا

جێگیر کرد و هێزێکی بچوکیان بردە ناو شاری کفریەوە و کاپتن (ج. ایج. سلمنت)[٤] کرا بە جێگری حاکمی سیاسی[٥] ئەو شارە دوو ئەفسەریش دانرا بۆ یارمەتیدانی (سلمنت) لە بەڕێوەبردنی کاروباری شاردا (یەکەمیان) ساجن مێجر (میر) ناوێك بوو ئەمیش هەر جوولەکەیەکی بەریتانی بوو هەمیشە کوتەکێکی بەدەستەوە بوو لە بەر ئەمە لەناو خەڵکدا بە (ئەبو چۆماغ)[٦] ناوبانگی دەرکردبوو (دووەمیان ئەفسەرێکی تر بوو ساچمە زەنێکی بەشانەوە بوو بەبیانووی سەگ کوشتنەوە بەکوچە و کۆڵانەکانی ناو شاردا ئەسوڕایەوە بەڕاست و چەپدا بۆ خۆنواندن تەقەی ئەکرد ئەم کابرایەش لەناو خەڵکدا بە (کویپەك ئوێلدران)[٧] ناوبانگی دەرکردبوو هەردوو ئەفسەرە بەریتانیاییەکە وەخت و ناوەخت بەناو شاردا ئەگەڕان و ئەگەر یەکێکیان لەسەر جۆگە ئاوەکە چاو پێ بکەوتایە دەست نوێژ ئەشوا ئەوا دایان ئەپلۆسی و ئەیان شاخاندە سەر منداڵ و ئافرەتیشا گوایە ئاوی جۆگەکەیان لێخن کردووە، لەناو بازاڕدا کەتێئەپەڕی ئەبێ خەڵکەکەیان لەبەر هەستێ و ڕێزیان بگیرێت و هەرچی سڵاوی لێ نەکردنایە ئەوا دارکاری ئەکرا، لەلایەکی ترەوە ئەگەر لادێییەك نەقیزەی بژنایەتە گوێی درێژەکەی ئەوا خۆیان نەقیزە ژەن ئەکرد تاوەکو بەزەیی ئینگلیز بۆ حەیوان دەربڕن، لە قوتابخانەشدا کوتەك بەدەست وانەی ئینگلیزی ئەوتەوە منداڵەکان بەدەستیەوە زیڕەیان ئەهات، دانیشتووانی شار لە کار و کردەوەی دەست و دایەرەی (سلمنت) زۆر دڵ پەست بوون چەند جارێك دادیان بردە بەر (سلمنت) ئەویش لە کردەوەی ئەوان خۆی کەڕ و لاڵ کردبوو، زوڵم و زۆر و کاری ناهەموار و کارکردن و بێکاری ئەم ئەفسەرانە لە ئەندازە بەدەربوو، چەند جوولەکەیەکی ناو بازاڕ و چەند دەرەبەگێکی زۆردار دەوری (سلمنت)یان دابوو بەرۆژ دەرەبەگەکانی لابوو شەوانیش خۆی و ئەفسەرەکانی لەناو خزمەکانیاندا بوون، لەو حەلەیش لەناو خەڵکدا دەنگ و باسێك بڵاوبووەوە کە - سلمنت) شێخ وەهابی تاڵەبانی بۆ قایمقامی کفری هەڵبژاردووە.

دانیشتووانی شار ئەوەندە دادیان بەرز کردەوە لە کاربەدەستانی بەریتانی دەستیان شت چوون سکالآیان بردە لای (برایم خانی دەلۆ) بەڵکو ئەو بتوانێت ئامۆژگاری سلمنت بکات و کاری تێبکات، بۆ ڕۆژی دووەم برایم خان و ئەکبەری برای و چەند کەسێك چوونە کفری و خۆی چووە سەر (سلمنت) لە کردەوەی دەستە و پەیوەندەکەی ئاگاداری کرد و داوای لێکرد جڵەویان بگرێتەوە، چونکە دانیشتووانی شار لێیان بێزارن هەروەها لە دەنگ و باسی هەڵبژاردنی شێخ وەهاب بۆ قایمقامیەتی کفری هەواڵی لێپرسی ئەویش ئەو دەنگ و باسەی بەرپەچ دایەوە و بەڵێنیدا دڵی دانیشتووانی شار نەڕەنجێنێ و دەست درێژی کردنیان لەسەر هەڵبگرن، هەروەها سەرنجی سلمنتی بەوە راکێشا کە کفری کەوتووەتە ناوجەرگەی دەلۆوە ئەبێ سەنگ و کێشی ئەم هۆزە رەچاو بگرن و بەهیچ کلۆجێك نابێت گوێ رایەڵی شێخ وەهاب بکەن، برایم خان خۆی و سوارەکانی بەناو شاردا گەڕانەوە لە کۆڵانێکدا هەستیان پێکرد لەلایەن دوژمنانەوە بۆسەیەکیان بۆ نراوەتەوە ئەمانیش دایان بەسەریاندا و تەقەیان لێکردن پیلان گێڕان لە ترساندا کۆڵان بەکۆڵان کشانەوە دواوە.

برایم خان لە پیلان و دوژمنایەتی ئینگلیزەکان زیاتر وریا بووەوە و لەوە دڵنیا بوو هەمیشە دژایەتی لەگەڵ هەموو نیشتمانپەروەرێك ئەکەن، دەست و پێوەندی (سلمنت) لەوسا زیاتر پێیان لێهەڵگرتبوو خەڵکیان توندتر ئەچەوساندەوە خەڵکەکەش هاواریان هەر بۆ برایم خان ئەهێنا لەولاشەوە شێخ وەهاب کاربەدەستانی دەمەزەردتر ئەکرد، هیچ چارەیەکی تر لەوە زیاتر بەدەستەوە نەما کە ئەبێت دەست بدەنە چەك و لەدوژمن راپەڕن، پێش ئەو هەنگاوە برایم خان پەیوەندی بە دەلۆییەکانی خانەقینەوە کرد (خورشید بەگ) ئامادەیی راپەڕینی پیشاندا لەولاشەوە پەیوەندی لەگەڵ (رەفعەتی سمایل بەگی داودە) کرد ئەویش لە بەریتانیەکان پەست بوو بڕیاریدا بەهاوکاری کردنی هۆزی (بەیات) شاری (دوزخورماتوو) لە جنگ سوپای بەریتانیا رزگار بکەن، جا پێش

ئەوەی بچینە ناو شۆڕشی کفریەوە ئاوڕێك لە شۆڕشگێڕانی خانەقی و دوز بدەینەوە بزانین ئاخۆ شۆڕشگێڕانی ئەو دوو شارە چۆن لە سوپای بەریتانی هاتنەکار. ئەو دوو شارە وەك دوو باڵ وەهابوون بۆ شۆڕشەکەی برایم خان.

## رزگار کردنی شاری (خانەقی – خانەقین)

(یاقوت الحموی) لە کتێبی (معجم البلدان)دا دەربارەی شاری (خانەقی) نووسیویەتی ئەڵێت شارێکە لەناوچەی رەشەخاکی عیراق کەوتووەتە سەر رێگای بەغداد بۆ هەمەدان، لە قەسر شیرینەوە شەش قۆناغە رێ دوورە موهر کوڕی موهەلهەلیش نووسیویەتی ئەڵێت: ( لە خانەقیدا سەرچاوەیەکی نەوت هەیە و دەست کەوتی زۆرە لەسەر رووبارەکەیدا پردێکی گەورە هەیە) کلۆدیۆس ریچ کە لە ساڵی ١٨٢٠دا چووەتە خانەقی ئەڵێت: پردەکەی خانەقی بریتیە لەچواردە چاو، خانەقی شارێکی سەردەمی ساسانیەکانە نوعمان کوڕی مونذیر مەلیکی حیرە لەم شاردا خراوەتە بەندیخانەوە. موسڵمانەکان کە لە ساڵی ١٦ی کۆچی خانەقینیان فەتح کرد بریتی بووە لەگوندێکی بچووکی سەرە رێگەی بەغداد و خۆراسان، هێزەکانی (هۆلاکۆ) لەسەر رێگەی بەغدایاندا رایان ماڵی، ئەم شارە لەسەرەنجامی زۆرانبازی نێوان سەفەوی و عوسمانیەکاندا گەلێك ناخۆشی چێشت و ئاساییشێکی رامیاری و ئابووری بەخۆیەوە نەبینی و دەربەدەری و نەخۆشی تیادا بڵاوبووەوە[٨] لەنیوەی دووەمی سەدەی چواردەدا دوو شاعیری وەك (مەولەوی) و (مەلا پەرێشان)ی تیادا ژیاوە، شارەکە کەوتووەتە ئەم لاوئەولای رووباری ئەڵوەندەوە.

دەربارەی ناوی ئەم شارە لێکدانەوەیەکی زۆر هەیە ئەوترێت ناوەکەی لە (حاجی قەلعە – حاجی قەرە)وە هاتووە، چونکە ساڵی ١٧٢٩ قەڵایەکی گەورە لەسەر رووباری ئەڵوەن بەناو (حاجی قەڵا) یان (حاجی قەرە)ەوە دروست کراوە، وە یان ئەڵێن دانیشتووانی شار ئەچوونە ئەو بەری ئەڵوەن بۆ کڕینی شت و مەك لەدوکانی کابرایەك (حاجی قەرە)ی[٩] ناو بووە، دیسانەوە ئەڵێن ناوی ئەم شارە

(خان جین) یان (خان قین)بووه, واته (خانی قاروقین) لەمەوە بووەته (خانەقین)[١٠].

خانەقی قەزایەکە سەر بەپارێزگای (دیاله) و حەفتا و چوار میل له دیالەوە دووره و سەرژمێری (٨٦٣٦)[١١] کەسێکە، له سەرەتای حوکمڕانی عوسمانیەکاندا سەروەختێك خانەقی سەنجەق بووه و سەربەولایەتی بەغداد سەرژمێری ئەوسای پێنج هەزار کەس بووه[١٢] له قەزای خانەقیندا بیست و یەك هۆزی کورد هەیه سەرژمێریان نزیکەی شانزده هەزار کەسێکە وەك هۆزی (باجەلان) ١٢٠٠ خێزان (شەرەفبەیانی) ٧٠٠ خێزان (دەلۆ) ٦٠٠ خێزان (سورەمێری) ٢٥٥ خێزان. لەسەردەمێکیشدا ئەم ناوچەیه لیوایەك بووه پێی ووتراوە (لیوا – پارێزگا)ی (باجەلان) و سنووری ناوچەی کفری و دوزخورماتوویشی گرتووەتەوە[١٣].

لەهۆزی دەلۆی ئەم ناوچەیه (خورشید بەگ) ناوبانگی دەرکردووە، دەلۆ بۆ پارێزگاری کردنی سنووری هاتبوونە ئەم ناوچەیە و نەوتەکەشیان بە سالانەی صەد روپیه له دەوڵەت بەکرێ گرتبوو، دووجار دەوڵەتی عوسمانی پێیان لەهۆزی دەلۆ داگرت ئەمانیش بەسەرۆکایەتی (خورشید بەگ) دایان بەکەژدا و پەلاماری سوپای عوسمانیاندا[١٤]. هەر کەشەڕی یەکەمی جیهان دەستی پێکرد خورشید بەگ له ریزی دوژمنەوە بازیدایە رێزی دۆستانی عوسمانی و بوو بەسەرۆکی گشت موجاهیدەکانی لیوای دیاله و هێزێکی میللی گەورەی پێکهێنا کە سوپای رووس هێرشیان هێنایە سەر خانەقی سوپای موجاهیدین شان بەشان سوپای تورك وەستان و دەستەویەخەی سوپای رووس کەوتنە شەڕ کردن بەتفەنگ و خەنجەر و شمشێر پەلاماری دوژمنیان ئەدا سەدەها کەس لەهەردوولا کوژران، تەرمی شەهیدەکانی ئەو شەڕە لەگۆڕستانی (عەلەمدار)[١٥] بەخاك سپێردران.

خانەقی بەحەفتا کیلۆمەترەیەك کەوتووەتە خوار کفریەوە رووباری سیروان ناوەندی ئەو پێدەشتەی نێوانیان ئەبڕێت، ئەو پێدەشتە راستاییە چەند

شەڕێکی قورسی نێوان سوپای عوسمانی و بەریتانیای بەخۆیەوە بینیووە، شاری (خانەقی) بەدەست سوپای رووسەوە تالآوێکی زۆری چێشت, (مس بێلّ) لە یادداشتەکەیدا بەم چەشنە رووداوەکەمان بۆ ئەگێڕێتەوە ئەلّێت (سوپای ئێمە کە بەدرێژایی رووباری دیالە بەرەو پێشەوە ئەچوو، سوپای تورك بەرەو رۆژئاوای رووبارەکە شکستی هێنا و ئەکشایەوە، کوردەکانی هەرێمی کفری لەوسەردەمە ئازوقەیەکیان بەیارمەتی نەئەدایە سوپای تورك وایان ئەزانی ئەوەندەی پێ ناچێت ئێمە ئەو ناوەش داگیر ئەکەین، ئێمە کە بەغدامان گرت رووسەکان لە قەسر شیریندا بوون، لە مانگی نیساندا ئێمە پەیوەندیمان بەرووسەکانەوە کرد، سەرۆکی حاکمە سیاسیەکانمان زۆریان لا گرنگ بوو ئێمە زوو (خانەقی) بگرین تاوەکو بتوانین دەسەلآتمان لەناو هۆزە کوردەکاندا زیاتر بکەین کە سەر بەئێمە بوون. مەترسی ئەم هەنگاوەش لەوەدا بوو هێزەکانمانی پەرت و بلآو ئەکردەوە، بە (مصطفى باجلان)مان گەیاند کە تا ئەتوانێت بۆ بەرژەوەندی ئێمە ئەمن و ئاساییش لە شاری خانەقیدا بپارێزێت، سالّی ١٩١٦ دانیشتووانی شاری خانەقی بەرەنگاری لێشاوی رووسیان کرد و یارمەتی سوپای تورکیاندا تا لە شاری خانەقی دەرباز بوون، لە نیسانی ئەم سالّدا -١٩١٧- وەختێك دانیشتووانی شار بەوەیان زانی کە رووسەکان هاوپەیمانی ئێمەن و بەرەزامەندی ئێمەوە هاتوونەتە ناو خانەقی دژیان نەوەستان، پاش چەند رۆژێك دەنگ و باس گەیشتە سەرۆکی حاکمە سیاسیەکان رووسەکان وا دەستیان کردووەتە خراپە کردن لەگەلّ خەلّکدا (مصطفى پاشا) داوای کرد حاکمێکی سیاسی بەریتانی بۆ خانەقی دابنرێت تا بەرژەوەندی ناو شارەکە بپارێزێت جەنەرالّ (مۆد) ئەم داوایەی لا پەسەند نەبوو نەوەك ببێتە هۆی ناکۆکی ناو هاوپەیمانەکانی شەڕ، زولّم و زۆری رووس گەیشتە رادەیەك لە سەر یەك نووسراومان لەم بارەیە لە هۆزەکانی باجەلآن، جاف، شەرەفبەیانی، تالّەبانی و پیاوە ناسراوەکانی خانەقی و قزرابات‌ەوە بۆ ئەهات، وەهای لێهات خەلّکەکە لەترسا ناوچەکەیان بەجێ ئەهێشت و ئەچوونە ئەو

ناوچەیەوە کە بەدەست سوپای تورکەوەیە. لەدوا ڕۆژەکانی نیسان مصطفی پاشا خۆی گەیشتە بەغداد و عەریزەیەکی لە دانیشتووانی شارەوە پێ بوو هاتبوو بۆ ئەوەی گیروگرفتەکانی ئەو ناوچەیە بخاتە بەردەست کاربەدەستان، (علی احسان پاشا) فەرماندەی سوپای تورك هەڕەشە نامەیەکی بۆ نووسیبوو دەربارەی ئەو کاغەزەی کە بۆ سوپای تورکی نووسیوە و دەستی ئەوان کەوتبوو بەهۆی ئەم کاغەزە لەلایەن تورکەکانەوە بەبێگانە پەرست درابووە قەڵەم و هەڕەشەی کوشتنی لێ کرابوو. مصطفی پاشا ئەوەی ئاشکرا کرد کە کردەوەی رووسەکان لە خانەقیدا لە کردەوەی تورکەکان زۆر خراپترە. رووسەکان لە ئێراندا توخنی دانیشتووان نەئەکەوتن، بەڵام دەربارەی ئەو کوردانەی لەژێر رکێفی عوسمانیدا بوون بەچاوی دوژمن تەماشای ئەکردن ئەو خەڵکەیان لە دارایی خۆیان رووت کردبووەوە، قەمچی دەستیان لە مصطفی پاشاش بەرز کردەوە و ئازوقە و شتومەك و ئەسپەکەیان لێسەند و سەعاتەکەشیان لەدەست کردەوە، رووسەکان هەرشتێکیان لەدوکاندارێك کڕی بێت پارەی کاغەزیان داونەتێ خۆشیان ئەیانزانی کە ئەم کاغەزە رەواجیان نییە، هەرچی مەڕ و ماڵاتێکی دەوروپشتی خانەقیشیان دەست کەوتبێت هەموویان تاڵان کردبوو خەلەکانیشیان لوس و باریك بۆ خۆیان درووبووەوە و بەری باخ و بێستانەکانیشیان لێکردبووەوە، لەبەر ئەمە دانیشتووانی ئەو ناوچەیە زۆربەیان لەترساندا رەویان کردبووە ناو تورکەکان، ساڵێك لەوەوپێش هۆزەکانی دەوروپشتی کفری یارمەتی سوپای تورکیان نەئەدا کاتێك کارەساتی خانەقینیان بیست دەستی یارمەتیان بۆ سوپای تورك درێژ کرد و دەمی چاڵە گەنمەکانیان بۆ کردنەوە و پێشکەشیان کردن، دەنگ و باسی خانەقی و قزربات ئەوەندە جەرگ بڕ بوو وای لەو خەڵکە کرد کە تورك لە رووس بەرەحمتر بزانن، ئەم کردەوە ناهەموارەی رووس بەرامبەر ئەو خەڵکە زۆر سوودی بۆ تورکەکان هەبوو، ئێمەش لە ناو ئەو خەڵکەدا بەبەدناوییەوە زڕایەوە، ئەوانەی لەمەوپێش ئێمەیان بەهاوڕێی خۆیان دائەنا بڕوایان پێمان نەما، رق و

ێـنەی خەڵکیش دەربارەی رووس تا ئەهات پەرەی ئەسەند بەجۆرێك پارێزگاری ەهەڵوێستیان لە کوردستاندا پێ نەئەکرا و خەڵکەکە ئەوەندە وەڕس بووبوون ـدرگای ئەم ناوچەیە بۆ دوژمن لەسەر گازی پشت کرابووەوە.

بەڕاستی زوڵم و زۆری سوپای رووس لەم ناوچەیە گەیشتبووە ئەوپەڕی جونکە دەنگ و باسی شۆڕشی ناوخۆیان پێ گەیشتبوو خۆیان لە هەرێمی خانەقیدا بەمیوانێکی بالادەست ئەژمارد و باکیان لەوە نەمابوو لەم ناوچەیەدا چی ئەکەن و سەرەنجامی چۆن ئەوەستێت؟ ئەمەش بەسەر ئێمەدا شکایەوە و بۆمان بووە کەلەپورێکی ناچیزە، ئەو دەنگ و باسەی لە مصطفی پاشا و رێگاکانی ـردوە بۆمان هاتبوو مەترسیەکی ئەوتۆی تیادابوو شایانی ئەوە بوو چاوێك ـبگێڕینە هەڵوێستمان، بەهۆی چەند هەڵوێستێکی عەسکەریەوە ئێمە نەمان ئەتوانی پێش رووسەکان خانەقی بگرین و پاش ئەوانیش نەئەکرا نوێنەرێکی سیاسیمان بنێرینە ئەو شارە نەوەك دڵی رووسەکانمان لێ بڕەنجێت ئەوانیش بوونی نوێنەرێکی ئێمەیان لەو ناوچەیەدا لا پەسەند نەبوو.

دەنگ و باسی نوێی خانەقی ئەوەی دەرئەبڕی کە سوپای رووس بەجارێ خانەقی و دەوروپشتیان روتاندووەتەوە و هەرچیەکیان چنگ کەوتبێت لە سنوور کردیانەتەوە ئەوبەر نۆ پیاو و دوو ژنیشیان کوشتووە، خۆشیان لە مانگی حوزەیراندا خانەقیان بەجێهێشت، دوابەدوای ئەوان کتوپڕ سوپای تورك ناوچەی خانەقی گرتەوە و پێشکەوت تا گەیشتە قزربات و چیای حەمرین و زاڵ بوونە سەر سەرچاوەی رووبارە گەورەکانی ناوچەی دیالە وەك (مەهروت و خریسان و خالص) و لە قۆڵێکی ترەوە (بەلەدروز) و (مەندەلی)یشیان گرتەوە، هێزەکانی ئێمەش لە تشرینی یەکەمدا نەختێ پێشکەوت و بەشێك لەچیای حەمرینی گرتەوە.

ئەمجارە تورکەکان کە خانەقینیان گرتەوە ئەو خانووبەرەی رووسەکان نەیان رووخاندبوو ئەمان بەتەواوەتی رووخاندیان، کەم خۆراکی ترس و ناخۆشی

خسته ناو خەڵکەوە، لەدوا ڕۆژەکانی مانگی ئاب سوپای عوسمانی جارێکی تر لەخانەقی کشانەوە و پاش ئەوان زۆربەی دانیشتووان گەڕانەوە سەر کەلاوەکانیان، باجەلانەکان گەڕانەوە سەر کێڵگەکانیان، وردە هۆزەکانی باشووری کفریش بەرەو مەندەلی و بەدرە و قەرەداغ ئەڕۆیشتن تا کەڵك لە دانەوێڵە شاراوەکانیان وەربگرن نەوەك لەبرسانا بمرن، سوارەی ئەو ناوچەیە تێکەڵ بەهێزەکانی (شێخ حەمیدی تاڵەبانی) بووبوون کە لە هەرێمی (گل) خۆی کۆ کردبووەوە، هۆزی داودە و تاڵەبانی هاوپەیمانێکی بەهێزمان بوون، ترسیان لە سوپای تورك نەبوو، دانەوێڵەی خۆیان لە ترسی ئەواندا نەشاردبووەوە، لەدوا ڕۆژەکانی مانگی ئەیلولدا پەیوەندیمان بە شێخ حەمید و سەرۆکەکانی ترەوە کرد، ئاگاداریان کردین هیچ ئازوقەیەکیان بەناو یارمەتیەوە نەداوەتە سوپای تورك، هەروەهاش ئەمێننەوە چونکە بەهیوای گەیشتنمان بوون تاکو دەستی یارمەتیان بۆ درێژ بکەین، هەر مەڕ و ماڵاتێکیشیان هەبوو بەرەو ژوور ڕەوانەیان کردبوو و لەئاوی زێ کردبوویاننە ئەوبەرەوە تاکو لەبەرچاو تورك نەیانهێڵن.

تورکەکان کە خانەقی و قزرباتیان گرتەوە چەند کەسێکیان لە پیاوە ناودارەکانیان لە سێدارەدا، ئێمە ئەوسا لەوبارەدا نەبووین کە کوردەکان دڵنیا بکەین و هانیان بدەینە سەر ئەوەی هێرش بەرنە سەر توورکەکان، ڕاستی ئەم شتانەمان نەئەزانی تا ئەو کاتەی لە کانونی یەکەمی ١٩١٨ شاری خانەقیمان گرتەوە و لەنیساندا کفریمان گرت ئەوسا لە ڕاستی گەیشتین.

ئەو ناخۆشیەمان کە لە خانەقی بینی لەهیچ لایەکی عیراقدا بەرچاومان نەکەوتبوو ئەو دێهاتانەی کە سوپای رووس خەڵەکانیان دووریبووەوە سوپای تورك ڕایان ماڵی و پاکیان کردەوە، بۆ ئەوەی نارەحەتی و ناخۆشی ئەو ناوە چارەسەر بکەین بەڕێوەبەرایەتیەکمان لەو ناوە دانا و (مێجەرسۆن)مان کردە سەرکردەی ئەم بەڕێوەبەرایەتیە کە ئەفسەرێکی شارەزای ئەو هەرێمە بوو کوردیشی باش ئەزانی چەند مانگێك تێکۆشا و بەجۆرێك لە بەڕێوەبردندا

سەرکەوت کە خەڵکی دڵنیا کرد تا وەهای لێهات کوردەکان لەسەر سنووردوە کە دەیانبیست بەڕێوەبەرایەتی بەریتانی دەستی یارمەتی بۆ درێژ کردون هەم لە برسانا و هەم لەژێر باری نەخۆشی تیفۆش ئەیان ناڵاند و روویان ئەکردە شار و ئەهانە خێوەت و نەخۆشخانەکانمانەوە بۆ ئەوەی یا تەندروستیان وەك جاران ساغ بێتەوە یاخود لەناوماندا بمرن[١٦].

سوپای تورك کە بەیەکجاری لەخانەقی کشایەوە (خورشید بەگی دەلۆ) لەگەڵ (عەلی ئیحسان پاشا) تا موسڵ چوو لەگەڵیا بەرەو تورکیا کەوتەڕێ لەزاخۆ دەنگ و باسی تەواو بوونی شەڕی یەکەمی جیهان و هەرەس هێنانی دەوڵەتی عوسمانی بیست و بڕیاریدا لەوە زیاتر نەڕوا و نەبێتە پاشکۆی سوپا شکستەکەی تورك کتوپڕ دەست بەرداری تورك بوو هاتەوە موسڵ لەوێشەوە گەیشتە کەرکوك، سوپای بەریتانی لە کەرکوك گرتیان و دایان بەدادگای خۆیان بەو تۆمەتەی یارمەتیدانی سوپای تورکی داوە، لەبەر ئەوەی لەخۆیەوە گەڕاوەتەوە داوای ئەوەیان لێ کرد یان دە هەزار روپیە سزا بدات.. یاخود بچێتە بەندیخانەوە، ئەویش لەوێوە پەیوەندی لەگەڵ هۆزەکەیدا کرد ئەوانیش لەماوەی دە رۆژدا پارەکەیان بۆ کۆ کردەوە و ناردیانە کەرکوك کتوپڕ بەرەڵڵا کرا و هاتەوە خانەقی و چووە (کانی ماسی) و لێیدانیشت لەناخی دڵیەوە بڕیاری دابوو کە تۆڵەی ئەو سزایە لە ئینگلیزەکان بکاتەوە.

لەو کاتەی برایم خانی دەلۆ بڕیاری رزگاری کردنی کفری دابوو پەیوەندی بەخورشید بەگەوە کرد[١٧] تا ئەویش خانەقی لە چنگ داگیرکەر دەربهێنێت، ئەمیش پەیوەندی بەکەسانی ناو هۆزەکەی و تێکۆشەرانی خانەقی و دەوروپشتیدا کرد و هات شۆڕشێکی بەرپا کرد و روویان کردە شاری خانەقی، کاتێك ئەم هەواڵە گەیشتە (کاپتن ماترسون)ی جێگری حاکمی سیاسی خۆی و ژنەکەی و دەست و دایەرەی شاریان بەجێهێشت شۆڕشگێڕانیش رۆژی ١٤ی ئابی ١٩٢٠ چوونە ناو شارەوە و بەیداخی بەریتانیایان هێنایە خوارەوە و

هۆیەك بوو بۆ قبووڵ کردنی فەرمانـدەیی ئـەم هـۆزە و ئـەو سـەرکردانەیان لەلایەن جەماوەرەوە.

٤- کاربەدەستانی بەریتانی بەزۆری کوتەك و چۆماغ بێگاریـان بـە جووتیـاران و دانیشتووانی شار ئەکرد بۆ دروست کردنی خانووبـەرە بـۆ سـەربازگەکانیان و راکێشانی هێڵی شەمەندەفەر، ئەفسەرە بەریتانیەکان زوڵم و زۆریـان گەیـشتە رادەیەك کە دانیشتووانی شار داد بەرنە بەر برایم خانی دەلۆ.

٥- پەیوەندی ئابووری و کۆمەڵایەتی نێوان هەرێمی کفری لەلایەکەوە شارەبان و خالص و بەعقوبە لەلایەکی ترەوە بەهێز بوو، هەمیشە کـاروانی ئـەو شـارانە بەبارە خورما و میوەجاتەوە ئەهاتنە کفری و لەو سەرەوە دانەوێڵـە و تـوتنی کوردستانیان بار ئەکرد، هۆزی (دەلۆ)ش لەگەڵ هۆزەکانی (عـەززە و لهێـب)ی عەرەبی پەیوەندی بەهێزیان هەبوو ئەم پەیوەنـدی نێـوان کـورد و عەرەبـەی ئەم ناوچەیەوەهای لە دوژمن کرد کە بڵێت (ئەو کوردانەی کە پڕوپاگەنـدەی عەرەب سـەری لێـشێواندبوون بەئاسانی بەسـەریاندا زاڵ بـووین، بـرایم خـان خۆی رای کرد و پیاوەکانی ئاوارە بوون، رەفعەت بـەگی داودەش چووە خـاکی ئێرانەوە)[٩٥].

## شیعر لە شۆڕشی برایم خاندا:

شـیعر هاندەرێکـە زات ئەخاتــە بــەر شۆڕشــگێڕان، رەفیــق حیلمــی لــە یادداشـتەکەیدا ئەیگێڕێتـەوە چۆن لـە مزگـەوتی حەیدەرخانـەدا شـاعیرانی وەکـو (عیـسی عبـدالقادر) و (محمـد مهـدی بـصیر)[٩٦] جـەماوەریان بەشـیعر خوێندنـەوە هانـداوە و تینیـان خـستووەتە بـەریان و هەڵمـەتیان پـێ بردوونەتـە سـەر دوژمـن، شاعیرانمان نە لەشۆڕشی شـێخ مـەحموددا و نـە لەشۆڕشـی بـرایم خانـدا دەورێکـی ئەوتۆیان نـەگێڕاوە، چـەند سـاڵێك لەمـەوپێش خواڵخۆشـبوو (بورهـان قـانع) ئـەم پارچە شیعرەی دامـێ کـە شـاعیرێکی نـەزانراو لـەو سـەردەمەدا بـۆ شۆڕشـی بـرایم خان ئەم شیعرەی هۆنیوەتەوە:

سەڵەف سەڵەفن سەنگەر گیرانـــەن

بریسکەی (شەنگ باریك) گرمەی (هۆرتمانەن)

سوارە وە ئارام، تفەنگچی وە لەنگەر

(برایم خـــــان) خۆی دێ ئەچێتە ســـەنگەر

بەر قەڵای (جوامێر) کریاوە پەمــە

(جوامێر) وە خەنجەر (تورکـــــان) وە قەمە

لە بان (داڵەمێز) داڵان گێچانـــەن

لە مـــــــــــاڵ (برایم خان) پەلکە بڕانەن[٩٧]

شاعیر بەم چوار دێرە شیعرە توانیویەتی ئازایـەتی (جـوامێر) و نەبـەردی (برایم خان) ئامێتەی یەك بکات و دوا رۆژەکـانی تێکشکانی شۆڕشی بـرایم خـان دەرببڕێت، وەك بیستم چەند کەسێکی تـر شـیعریان دەربـارەی بـرایم خـان وتـوە بەڵام چەندم کرد دەستم نەکەوت.

**ئافرەت لە شۆڕشی برایم خاندا :**

ئـافرەتی کـوردەواری بـارێکی گرانـی کەوتووەتـە ئەسـتۆ، منـداڵ بـەخێو ئەکات، کاروباری ناوماڵ بەجێئەهێنێت، خزمەتی مێردەکەی ئەکات، میـوان بـەڕێ ئەخات، شان بەشان برا و قەومەکانی مەلۆ ئەنێتەوە درەو گێـڕە ئـەکات، خـەرمان هەڵئەگرێت، بەدڵ و دەروونێکی پاکەوە نوێـژ و تاعـەتی خـۆی ئـەکات، کە ئـاگری شەڕ لێیانەوە نزیك بووەوە دەست ئەداتە چەك وەك شێر ئەچێتە پێـشەوە، تێکـڕا ئافرەتی ناو کوردەواری سەنگین و بەتوانا و بەئارام و پاك و تەمیزە.

کاتێ (نەنەخان) دایکی برایم خان بیستی هەردوو کوڕەکەی (کەمەر خـان و حسین خان) بەدەست سوپای تـورك شـەهید کـراون پرچـی نەڕنیـەوەو نـەڕوخا بـەڵکو دانـی بـەخۆیا گـرت و چـوو نوێـژی لەسـەر کـردن و تەرمـەکانی بـەخاك سپاردن.

حەلیمـەی دادام[٩٨] بـۆی گێڕامـەوە چـۆن بـەبرە ئافرەتێـك بـەرەنگاری چاوشـێکی دڵرەقـی عوسمـانی بـوون کـە هەمیـشە بـەزۆر دانەوێڵـەی لـە خـەڵك ئەستاند, ئەو برە ئافرەتـە توانیـان چاوشـە مـل سوورەکە مـار کوژ بکـەن و ئنجا بەقۆڵ بەستراوی بیدەنە دەست سەربازگەی عوسمانییەوە.

یـەکێك لـەو ئافرەتانـەی کـە بەشـداری لـە شۆڕشـی بـرایم خـان کـرد (نەعەنێر)ی بەناوبانگ بوو, (نەعەنێر) ناوی (نەعیمەی کچی مستەفا)ی دەلۆییـە شـوئەکاتە (عبـدالباقی) لاوێکـی تورکمـانی کفـری, لـە مێردەکـەی سـاڵی ١٩١٠ ئیبراهیمی کوری ئەبێت, کە سەفەر بەربوو ئەبنـە سەفەر بـەر و ئـیتر ناگەرێتـە دواوە, چەندە داوای لێ ئەکەن شویەکی تر ناکاتەوەو دەست ئەکاتـە چەخماخسازی – واتە پیشەی تفەنگ چاککردن و فیشەك هەڵوەسـتن – کە شۆڕشی بـرایم خـان بوو چووە پاڵی شۆڕشگێران و بەرگی پیاوانی پۆشی و یەکێك بـووە لـەو کەسانەی لـە رۆژی یەکـەمی شۆڕشـدا بـە سـواری ئەسـپەکەی تـاوی داوەتـە سـەر سـەرای حکومەت, پاش کۆتایی هاتنی شۆڕشی برایم خان گەڕایـەوە روانـی ماڵەکـەی تـالأن کراوە هات سەر لە نوێ دەستـی دایـە بازرگـانی لـە نـاو بـازاڕدا دوکـانێکی دانـاو بـۆ خۆی چوە سەری ئێستاش لە بیرمە منداڵ بوین بانگی ئەکردینە لای خۆی و وردە ئیشی ئەدا بەسەرماندا چونکە تاقانەکەی لەبەر دەستدا نەبوو, ئەم ئافرەتـە سـاڵی ١٩٣٦[٩٩] کۆچـی دوایـی کـرد و لەبـەر ئـەوەی ئـازا و پیاوانـە هەڵکـەوتوو بـوو نـاوی (نەعـەنێر)ی بەسـەرا سـەپێنرا و بـرایم خـانی دەلـۆش بـە (کاکـە نـەعیم) بـانگی ئەکرد و رێزی لێئەنا[١٠٠].

تا لەم چەند ساڵەی دواییدا هەر پرسە و شیوەنێك لە کفریدا ببوایە ئـەوا (یایە) کە ئافرەتێکی باڵا بەرزی دەنـگ زوڵاڵ بوو بەبەیت و هۆنراوە پێش ستایش کردنی مردووی ئەو رۆژە بەسەر برایم خانـدا بـەیتی ئـەووت ئینجا ئەهاتـە سـەر شۆڕە سوارانی تری مەیدان و بەشی مردوەکەی ئەو رۆژەشی لێئەدا.

**بەراورد کردنێك لەنێوان شۆرشەکەی شێخ مەحمودی حەفیدو شۆڕشی برایم خانی دەلۆ:**

هەر کە سوپای بەریتانی شاری بەسرەی داگیر کرد و بەرەو پێشەوە تەکانیدا، ئایین پەروەری و هاونیشتمانێتی پالی بەجەماوەرەوە نا بەرگری لەداگیرکەری غەیرە دین بکەن، ئەگەر کوژران بەپلەی شەهادەت ئەگەن، هەزار کوردی موجاهید چوونە ژێر ئالاّی شێخ مەحمودەوە بەرەو باشووری عیراق بەخۆیان و چەکی دەستیانەوە بەسەر سواری کەوتنەڕێ. برایم خان و هەڤالانیشی[١٠١] ریزی پێشەوەی موجاهیدینیان گرتبوو، شۆڕە سواری کورد لە شعیبەدا چوونە کۆڕی شەڕەوە خوێنیان تێکەلاّوی لی ئەو دەشتە بوو، ئەمە یەکەم ئەلّقەی یەکگرتنی شۆڕشگێڕی بو لەنێوان شێخ مەحمود و برایم خاندا.

کە شێخ بەرەو سلێمانی گەڕایەوە و لە کفریەوە تێپەڕین شەوێك لە ئاوایی برایم خان میوانداریان کرا، کە شێخ مەحمود سالّی ١٩١٩ لە سلێمانی فەرمانڕەواییێکی میللی دانا برایم خانی دەلۆ و وەیسی بەگ[١٠٢] بۆ پیرۆزبایی چوونە خزمەت و ماوەیەك لەوێ مانەوە و بوون بە باوەڕپێکراوی شێخ لەم ناوچەیە و داوای لێ کردن پەیوەندییان لەگەلّ جەماوەری ناوچەکە پتەو بکەن و ئەگەر هاتوو فەرمانڕەوایەکەی لەناو چوو ئالاّی شۆڕش لە گەرمیانەوە هەلّ بکەن.

حوکمدارێتی شێخ مەحمود لە سلێمانی لە سەرەتای سالّی ١٩١٩ دامەزرا, پاش ماوەیەکی کەم ئینگلیزەکان لە شێخ کەوتنە بڕو بیانوو و قۆرت خستنە بەر, شێخ لە ١٩١٩/٥/٢١ دەستی دایە چەك شۆڕشی بەرپاکرد شۆڕشەکە لە ١٩١٩/٦/١٩ بە بریندار کردنی شێخ و بە دیل گرتنی دوایی هات.

**لەیەك چونێکی گشتی نێوان شۆڕشەکەی شێخ مەحمودی سالّی ١٩١٩ و شۆڕشی برایم خانی سالّی ١٩٢٠دا هەیە ئەویش لەم بەراورد کردنەدا خۆی دیاری ئەکات:**

١- لە سلێمانیدا (مێجەر سۆن)و هاوڕێکانی بە چاوێکی سوکەوە دەیانڕوانیە جەماوەر (عەزیز خان)ی پیاویان لە صاحیبەکەیان توند و تیژتر بوو بە دارەکەی[١٠٣] دەستیەوە لەگەلّ خەلّك گفتوگۆی ئەکرد لە کفریشدا (سلمنت)

شێوازە ناهەموارەکەی سۆنی گرتبووە بەر و (ئەبوو چۆماغ)ی هەڤاڵ و پیاویشی لە عەزیز خانی لەمەڕ سۆن دڕندەتر بوو.

٢- شێخ مەحمود ئینگلیزەکانی بەدیل گرت و لە دەبۆکەی ناو شار حەپسی کردن برایم خان (سلمنت)ی بەدیل گرت، بەڵام لەشاردا حەپسی نەکرد بەڵکو ناردیە ئاواییەکەی خۆی.

٣- پاش هەفتەیەك لە رزگار بوونی سلێمانی لەچنگ سوپای بەریتانی هێزی ئینگلیزەکان لە تاسلوجەدا بەفەرماندەیی مولازم (پۆل) پەلاماری هێزێکی شێخ مەحمودیاندا و شەڕێکی قورس لەنێوانیاندا روویدا لە ئەنجامدا (پۆل) و هەشت کەس لە سەربازەکانی کوژران و دوانزدەشیان بریندار بوون[١٠٤]، ئەو دوایی هێزەکەشیان پاشەکشەیان لێکرد، لە کفریشدا پاش هەفتەیەك هێزێکی گەورەی ئینگلیز و بەکرێ گیراوان هێرشیان بردە سەر شۆڕشگێڕانی کفری ئەنجامی ئەمانیش لە ئەنجامی دەست درێژکەرانی سەر هێزەکەی شێخ مەحمود خراپتر بوو.

٤- (مشیری حەمەی مام سلێمان)ی[١٠٥] هەمەوەند بووە سەرمنێزەی دوژمن دژی هێزەکانی کورد ئەوەبوو لەدزە رێیەکەوە کەوتە پێش سوپای بەریتانی و لە شەڕی دەربەندی بازیانی رۆژی ١٩ی حوزەیرانی ١٩١٩دا بوو بەهۆی بەدیل گرتنی شێخ مەحمود، لەکفریشدا (شێخ حەمیدی تاڵەبانی) و شێخ وەهابی کوڕی خۆیان کردە سەرمنێزەی سوپای بەریتانیای داگیرکەر دژی شۆڕشگێڕان.

٥- بۆ کوژاندنەوەی شۆڕشەکەی شێخ مەحمود بەریتانیاییەکان لە کەرکوکەوە بەفەرماندەی جەنەڕاڵ (فرایزەر) سوپایەکی قورسیان ناردە سەر شێخ، پاش ساڵێك هەر لەسەربازگەی بەریتانیا لە کەرکوکەوە مێجەر (لۆنگریك) هێزێکی گەورەی نارد بۆ کوژاندنەوەی شۆڕشەکانی لەیلان و دوز و کفری.

٦- شۆڕشی شێخ مەحمود نزیکەی مانگێك دەوامی کرد شۆڕشەکەی برایم خانیش نۆزدە رۆژی خایاند.

٧- شێخ مەحمود لە ئیستعماری بەریتانیا دڵنیا نەبوو بەرامبەر داگیرکەر چەکی فڕێ نەدا ئەوەبوو لە دەربەندی بازیاندا بریندار کرا ئەوسا بەدیل گیرا، برایم خانیش لەهەمان دوژمن دڵنیا نەبوو، پاش خۆکشانەوە، چەکی فڕێ نەدا، بەبەڵێن و قسەی چەوریان تەفرەی نەخوارد، ئەوەبوو نەبەزیندوێتی چنگیان کەوت و نە بەبرینداری و مردوێتی تەرمەکەشیان بەدەست نەکەوت.

## پەراوێزەکانی بەشی چوارەم:

١- ئەم شەڕە بەدووەم شەڕی حەمرین ناوبانگی دەرکرد.

٢- بڕوانە: حرب العراق، شکری محمود ندیم، چ٤ – ١٩٠٤، ل١٧٢.

٣- سێ چەکدارەکە یەکێکیان (برایم حەمە خانی گێژ) و ئەویتریان (حسین کاکەمەند)ی دەلۆیی بوو کە زاوای برایم حەمە خان بوو دەلۆییەکی تریان لەگەڵدا بوو.

٤- (سلمنت) یان (سلمون) وە یان (شلێمون) جوولەکەیەکی بەریتانی بوو.

٥- ئینگلیزەکان بۆ بەڕێوەبردنی مەرکەزی لیوا (حاکمێکی سیاسی) بەریتانیان دائەنا و لە قەزاکانیشدا جێگری حاکمیان دائەنا، چ حاکمی سیاسی و چ جێگرەکەی سوپا بوون.

٦- چۆماغ – عەرەبیە، کوردیەکەی (کوتەك) ئەگرێتەوە. (ئەبو چۆماغ) واتە (کوتەك بەدەست) ئەم ئەفسەرە داردەستێکی سەر خڕی بەدەستەوە بوو بەلاستیکێکی پێچ پێچ دراو بوو لە کوتەك ئەچوو.

٧- (کویپەك ئوێلدران) واتە (سەگ کوژ).

٨- بۆ زیادە زانیاری بڕوانە (قضاء خانقین, دراسة في جغرافية سكان, رسالة ماجستير, خليل اسماعيل محمد, ت ١٩٧٣/١).

٩- حاجی قەرە (قەرە) بە تورکی واتە رەش, یەعنی (حاجییە رەش).

١٠- بڕوانە – رۆژنامەی (التآخي) ژمارەی رۆژی ١٩٧٢/١٠/٧.

١١- بڕوانه – موجز تأريخ البلدان – عبدالرزاق الحسنى ١٩٧١, ل١٤٩.

١٢- قاموس الإعلام, شمس الدين سامى, ساڵى ١٩٨٦ پيتى (خ).

١٣- بڕوانه مێژووى كورد و كوردستان, محمد ئەمين زەكى, به عەرەبى, ط٢, ١٩٦١, ل٢٠٨.

١٤- رۆژى ١٩٧٩/٨/٢٦, له كەلار خواڵێ خۆشبوو (فتح الله بەگى دەلۆ) ئەمەى بۆ گێڕامەوە ئەوساكە ئەويش پشتگيرى سۆڕشگێرانى گرتبوو.

١٥- بڕوانه (خانقين خلال ربع قرن١٩٠٠ – ١٩٢٥), فاضل كريم رۆژنامەى (التآخى) رۆژى ١٩٧٣/٦/١٠, لەوانەى لەو رۆژە شەهيد كران (حاجى عەلى ئاغاى باجەلان) (شێخ صالح)ى ناو جموور بوو.

١٦- بڕوانه: فصول من تأريخ العراق القريب, مس بێڵ, وەرگێڕى – جعفر الخياط, ل ١٤٧ ئەو نەداريى و برسێتى و كارەساتانەى تووشى دانيشتوانى ناوچەكە هاتبوو سەرەنجامى داگيركەربوو, رووس بێت يان عوسمانى يان ئينگليز تا وەهاى لێ هات ئيتر باوەريان به هيچ بێگانەيەك نەمێنێت.

١٧- له حوزەيرانى ١٩٧٢ دا خواڵێ خوشبوان (خەليل بەگ دەلۆ و رەزاى ئەمين دەلۆيى) ئەم راستيەيان بۆ گێڕامەوە.

١٨- ئەگێڕنەوە ئەڵێن يەكێك له كۆڕى شەڕدا به (محمد ئيسماعيل)ى ووت فلانى ئەوا قاچت پێكرا بكشێرەوە دواوە, ئەويش وەلامى دايەوە و ووتى: نەخێر نەپێكراوم, شەڕ دوايى هات و سەركەوتنيان بەدەست هێنا ئينجا ووتى: ئەبێ له كۆڕى شەڕدا ئەگەر برينەكەمان كارى نەبوو ووره بەرنەدەين.

١٩- بڕوانه – ثورة العشرين الوطنية التحررية – (ل. ن كاتلوف), وەرگێڕى (عبد الواحد كرم) ل (١٤٠) ئەميش له رۆژنامەى تايمسى لەندەنى رۆژانى ٨/٣١ و ١٩٢٠/٩/١ى وەريگرتووە.

٢٠-بڕوانه: خانقين خلال ربع قرن ١٩٠٠ – ١٩٢٥ فاضل كريم رۆژى ١٩٧٠/٦/١٣.

٢١- (ماوزەر محمد ئیسماعیل) ئەم روداوەی بۆ گێرامەوە. (ماوزەر) تا ئێستا ماوە و تەمەنی لە نەوەت تێ پەڕیوە, کە ئەو روداوانەت بۆ ئەگێڕێتەوە بە جۆرێك ئەکەوێتە جۆش و خرۆشەوە ئەڵێی وا لە گۆڕەپانی شەڕدایە ناهەقیشی نیە لەو رۆژەی ئەم لە دایك بووە باوکی چاوی بە تفەنگێکی تازە بابەت هەڵێناوە و ئەوەندە ئەو تفەنگەی خۆشویستوە تا ناوی کوڕەکەی بەناو ئەو ماوزەرەوە ناوی لێ ناوە.

٢٢-(دوزخورماتوو) وشەیەکی تورکمانی کوردی تێهەڵکێشراوە بریتیە لە (دوز ، خورما ،توو) — (دوز) خوێ (خورما و توو)یشیان کوردیە، لەدوزخورماتووی دەوروپشتیدا ئەم سێ بەرهەمانە هەیە.

٢٣-(بەیات) هۆزێکە لەناو خۆیاندا بەشێکیان تورکمان و بەشێکیان عەرەبن کوردیان تیادا نییە، هەموویان (سوننی) مەزهەبن.

٢٤- بڕوانە: رحلة المنشی البغدادي، وەرگێڕ: عباس عەزاوی، ل٨٤.

٢٥- مەبەستی لەسەرا کۆشکەکەی (عومەر بەگ)ی بەغدادیە، لە بەغداوە عومەر بەگ ئامادەیی پیشاندا ئەو چەند رۆژەی ریچ و دەست و دایەرەکەی لەدوزدا بمێننەوە لەو کۆشکەدا بحەسێنەوە.

٢٦- تیمار: بەو پارچە زەویە ئەمیریە دەگوترا کە لەلایەن دەوڵەتەوە ئەدرایە هەندێ کەس تا دەیەکی دەست کەوتەکەی بۆ خۆیان لێ وەربگرن بەرامبەر بەوەی لەکاتی پێویستدا ژمارەیەك چەکداری ئامادەکراو پێشکەش بەدەوڵەت بکەن.

٢٧- دەفتەردار باوکی عومەر بەگە و جاران فەرمانبەری خەزینە بووە.

٢٨- بڕوانە: رحلة جیمس ریچ ساڵی ١٨٢٠، ل١٩ — ٢٤.

٢٩- جوغرافیای عوسمانی، چ ١٣٢٨ی کۆچی، ل١٤١.

٣٠- بڕوانە: کتێبی (کورد، ترك، عەرەب)، ئەدمۆندسن، وەرگێڕاوی عەرەبی، ١٩٧١، ل٢٤٧.

٣١- (كفـرى) ئەكەوێتـە ناوەڕاسـتى ڕێگـەى (خانـەقى – دوز)، دوز لـەباكوورى كفريدايە و خانەقيش دەكەوێتە باشووريەوە، (كفرى) وەك دڵى شۆڕش وەها بوو (خانـەقى) و (دوز)يـش هـەردوو بـاڵى شۆڕشـەكە بـون، پەيوەنـدى نێوان سەرۆكى شۆڕشگێڕانى هەرسێ شارەكە هـەبوو مەبەستيـشيان هەريـەك بـوو هەموولايەكيشيان برايم خانيان بە برا گەورە دانابوو.

٣٢-ڕۆژنامـەى (العـراق) ژمـارە (٦٨)ى ڕۆژى ١٩ى ئـابى ١٩٢٠، هـەروەها ڕۆژنامـەى (الموصل)ى ژمارە (٢٦٣).

٣٣-بڕوانە: گۆڤارى (الاخاء)ى توركمانى، عبدالحكيم رژى اوغلو، ژمارە (٧)ى ساڵى ١٩٧٠، ل٢٤.

٣٤- (ڕۆغزايى) و (تەرخانى) دوو تـيرەى گـەورەن لـە هۆزى (جـاف) لەگـەڵ بـرايم خاندا پەيوەنديان باش بووە ئاواييەكانيان كەوتبووە ڕۆژهەڵاتى سەرقەڵاوە.

٣٥-بڕوانە: ئەرنۆڵد وێلسن جێگرى حاكمى گشتى مەلەكى بەريتانى لە عيراقدا لە سەردەمى داگيركردندا، شۆڕشـى عـيراق، بزووتنـەوەى كفـرى، وەرگێـڕ: جعفـر الخياط، چ ١، ساڵى ١٩٧١، ل١١٦.

٣٦-(عثمان سليم وەنداوى) موديرى ماڵ بوو (عەلى ئەفەنـدى) مـوديرى ناحيـەى قەرەتەپـە بـوو، فەرمانبـەرە پێـشكەوتووەكانى ئـەو سـەردەمە ئەمانـە بـون (رفعـەت مبـارەك) ئـەمينى سـەندوق (مبـارەك ئەفەنـدى) بـاوكى مـەئمورى نفوس بوو، (سيد نورى) سەرۆكى شارەوانى، (عزيز بـەرقى) سـەرۆكى دەرەك، (خان صاحيبى هيندى) محاسب، (عزالدين كاتب زادە) مەئمور شعبە، (محمـد سعيد سوەيلى) مفتى شار، (مەلا بادر) كاتبى بەلەديە بون.

٣٧-(محمد سعيد وەنداوى) و (بەهجەت بابان) سەر بەشۆڕشـى بـرايم خـان بـون و پێشەكى ئاگاداريان لە شۆڕشەكە هەبو.

٣٨- (جەمیل بەگی مەجید پاشای بابان) پیاویکی هێمنی لەسەرخۆ بوو سەر بە راپەڕین و شۆڕش نەبوو، زۆربەی دانیشتووانی گوندەکانیان دەلۆیی بون و پەیوەندی بابانەکان بەدەلۆوە لەوەش بەرەو ژوورتر بوون.

٣٩- لەناو ئەو پۆلیسانەی کە بەتوند و تیژی بەرەنگاری کردبوو (حەمە زەفە) بوو کە خۆی دەلۆیی بوو، پێیان وت بۆ وا بەرەنگاریت کرد وتی من مەئمورم گەورەکەم چی ئەمرێکی پێدام ئەبێ جێبەجێی بکەم با دژی هۆزەکەی خۆشم بێت.

٤٠- (ناظم محمد سەعید ونداوی) گێڕایەوە ئەڵێت: ئەوسا ئێمە منال بووین خەریك بوین لاشەی ئینگلیزەکان بەناو شاردا رابکێشین بەلام گەورەکانمان رێیان نەداین.

٤١- برایم خان داوای لە (جەمیل بابان) کرد بەشداری ئەم ئەنجومەنە بکات و ئامادەیی ئەوەی پیشاندا سەرۆکایەتی شارەکەی بداتە دەست بەلام (جەمیل بەگ) لەگەڵ (شەمسە خان جاف)ی هاوسەریدا بۆ ماوەیەك چوون بۆ (کەلار)، خوالێخۆشبوو (ئەحمەد بەگی جەمیل بەگ) کە لە ساڵی ١٩٧٥دا کۆچی دوایی کرد بۆی گێڕامەوە کە شەمسە خانی دایکی لە هەڵوێستی جەمیل بەگی مێردی ناڕەزا بوو.

٤٢- (وەیسی بەگ) سەرۆکی رەسمی هۆزی دەلۆ بوو، برایم خان لە شۆڕشدا هەڵکەوتووتر بوو وەیسی بەگ پشتی برایم خانی بەرنەدا، ساڵی ١٩٢٥ کۆچی دوایی کرد.

٤٣- کاکەمەند یەکێك بوو لە شۆڕە سوارانی دەلۆ، لە سوارەی حەمیدی و شەڕی شعیبەدا بەشداری کردبوو، ساڵی ١٩٤٥ لە تەمەنی سەد و دە ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

٤٤- (حاجی محمد) یەکێك بوو لە سەرۆکەکانی تیرەی تەرخانی سەر بەهۆزی جاف.

٤٥- (حەمە جان) یەکێك بوو لە سەرۆکەکانی تیرەی رۆغزایی سەر بەهۆزی جاف.
٤٦- (برایم وەستا مەحاو) لە دانیشتووانی شاری کفری بوو، خوشکی وەیسی بەگی مارە کردبوو، کاتبێکی شارەزا بوو و سەر بەشۆڕشگێڕانی دەلۆ بوو.
٤٧- خاوەن موڵکی گەورە (دەرەبەگ) ئەو کەسەیە لەنێوان (٥٠٠ – ١٠٠٠) هەکتار یا زیاتر زەوی هەبێت، خاوەن موڵکی ناوەندی لەنێوان (٣٠ – ٥٠٠) هەکتارە زەوی هەیە، خاوەن موڵکی بچووك لە ٢٠ هەکتارە زەوی کەمتری بەدەستەوەیە.
٤٨- ئەم ئاواییە بە دە کیلۆمەترێك ئەکەوێتە رۆژهەڵاتی کفریەوە بە ئاوایی (برایم خان) ناوبانگی دەرکردووە، ئێستا سێ ئاوایی بچووکی لێبۆتەوە.
٤٩- (شەرەف کوڕی برایم خان ١٩١٢) دێیەکی بۆ خۆی و کوڕەکەی ئاوەدان کردووەتەوە ئەڕوانێتە سەر دۆڵێکی پڕ دار و چیمەن و بەحەوت کیلۆمەترێك لە ئاوایی برایم خانەوە دوورە، شەرەف سێ کوڕی هەیە (محمد شکور ١٩٤٦) (محمد کریم ١٩٤٨) (ئەمیر ١٩٥٠)، (عەزیزی برایم خان ١٩١٠ – ١٩٦٧) چوار کوڕی هەیە (ئیسماعیل ١٩٣٤) (حاجی عاص ١٩٤٤ – ١٩٨٣) (محمد ١٩٤٧) (پەروێز ١٩٤٩) لەو گوندە دائەنیشن کە بەئاوایی برایم خان بەناوبانگە و کەوتووەتە سەر رێگەی کفری – سەرقەڵا (جەعفەری برایم خان) سێ کوڕی هەیە (حاتەم ١٩٤٨) (بەشارەت ١٩٥٢) (بەکر ١٩٥٤)، (حەمیدی برایم خان)یش سێ کوڕی هەیە (صابر ١٩٥٢) (حبیب ١٩٥٧) (سمین ١٩٦٢) کوڕانی (جەعفەر و حەمید) ئاواییەکیان بەرامبەر ئاوایی برایم خان بۆخۆیان ئاوەدان کردووەتەوە. کوڕەزاکانی برایم خان خەریکی کشتوکاڵن و ژیانێکی مام ناوەندیان هەیە.
٥٠- بڕوانە رۆژنامەی (العراق) ژمارە (٧٦)ی رۆژی ٣٠ی ئابی ١٩٢٠.
٥١- (زەرداو) ئاواییەکە نزیکەی (٢٠) کیلۆمەترێك کەوتووەتە خوار کفریەوە، زەوی و زاری ئەم ئاواییە عائد بە ئەوقافە و تا ساڵی ١٩٢٠ بەدەست ئاغاکانی

زەنگەنەوە بووە، لەو ساڵەوە تا رۆژی ئەمرۆمان کەوتە دەست شێخەکانی تاڵەبانی و ئێستا (شێخ عەتای کوڕی شێخ جەماڵ) سەرپەرشتی ئەکات.

٥٢- لەوسەردەمە بەرەشاش (مەتریلۆز) ئەوترا.

٥٣- ئەیان گێڕاوە کە تاویان ئەدایە سەر هیندیەك ئەیوت (والله رەفیك موسڵمان هەی) واتە (والله من هاوڕێتم موسڵمانم).

٥٤- بڕوانە: ابراهیم خان ثائر من کردستان، د. مکرم تاڵەبانی ١٩٧٠، ل٨٦ — ٨٨.

٥٥- بڕوانە: فصول من تأریخ العراق القریب، مس بێل، وەرگێڕی بۆ عەرەبی جعفر الخیاط ١٩٧١، ل١٥٢ — ١٨٥.

٥٦- بڕوانە: العشائر الکردیة، وەرگێڕی بۆ عەرەبی فوئاد حەمە خورشید، ١٩٧٩، ل١٣٧.

٥٧- بڕوانە: کورد، تورك، عەرەب، ئەدمۆندسن ١٩٧٦، وەرگێڕی عەرەبی.

٥٨- (سیاە مەنصور) ئاواییەکە لە دەشتی ناوچەی (قەرە حەسەن)ی سەر بەمەرکەزی پارێزگای (تەئمیم — کەرکوك) و کەوتووەتە باشووری لەیلانەوە، ئەم ئاواییە و چوار ئاوای دیکەی ئەو ناوچەیە سەر بەشێخ قادری تاڵەبانی بوون و هەمیشە لەرێزی نیشتمانپەروەراندا بووە و شێخ لەناو خەڵکدا هەر بەشێخ قادری سیاە مەنصور ناسراوە و لەساڵی ١٩٥١دا کۆچی دوایی کردوە، پاش خۆی شێخ حەبیبی کوڕی لەسەر رێڕەوی باوکی رۆیشتووە.

٥٩- بڕوانە: رۆژنامەی (پێشکەوتن) رۆژی ٢٦ی ئابی ١٩٢٠.

٦٠- لەو حەلە (میلەر) یارمەتیدەری لۆنگریك بوو (مەجید یەعقوبی) سەرۆکی شارەوانی و (مامۆستا ئەحمەد قطب) قازی و (عبدالقادر کاظم وەنداویش) مودیری مالی کەرکوك بوون.

٦١- لەو چل و چوار شەهیدە بیستیان لە هۆزی بەیات و هەژدەیان لە هۆزی داوده و سێیان لەهۆزی سائحی عەرەب و سێی تریشیان لە تورکمانی دانیشتوانی

دوز بوون یەکێکیان ناوی (جەعفەر کەچەچی) بووە، هەر لە خەڵکی دوز دەیەها بریندار هەبوون وەك (عەباس قوشچی و موراد تۆپاڵ).

٦٢-روپیە، دراوێکی هیندیە، هەر روپیەیەك بەرامبەر (٧٥) فلسە بەپێی بازاڕی ئەوسا و ئێستا نرخی بەرز بووەتەوە.

٦٣-بڕوانە: رۆژنامەی (الموصل)ی ژمارە ١٩٢ی رۆژی یەکی تشرینی دووەمی ١٩٢٠.

٦٤-هۆزی (عەززە) یاخود (ئەلعەزە) دژی بەریتانیا ئاڵای شۆڕشیان هەڵکرد بوو شاری (خالص – دەڵتاوە)یان رزگار کرد و ماوەیەك حوکمڕانیان تیادا کرد، پاش تێکشکانی ئەو راپەڕینە ئەم دوو سەرۆکە خۆیان نەدا بەدەستەوە و روویان کردە چیای (حەمرین) و خۆیان تیا قایم کرد، لەو کاتەشدا شۆڕشی دەلۆش شکستی هێنا و شۆڕشگێڕانیش زۆربەیان روویان کردە ئەم چیایە، هەردوولایان لەوێ یەکیان گرتەوە (وەیسی بەگ) کە چوە دیدەنی شێخەکانی عەزە زۆر رێزیان گرت، ئێوارەیەکیان لە دانیشتنێکیانا کابرایەکی (عەزە) لە وەیسی بەگ رائەپەڕی و ئەڵێت ئێمە خوێنێکمان لەبەیندایە و قەرزارمانن (حەبیب خەیزەران) لەمە زۆر توڕە ئەبێت و رووی دەم ئەکاتە کابرا و ئەڵێت (ئێمە و دەلۆ هیچ خوێنێکمان لە نێواندا نەما، هەردوولامان ئێستا یەك دوژمنمان هەیە ئەویش بەریتانیایە) کابرا بێ دەنگ بوو و کشایە دواوە (مەجیدی حاجی فتح اللهئەمەی بۆ گێڕامەوە کە ئێستا تەمەنی نزیکەی هەشتا ساڵ ئەبێت)*.

٦٥-بڕوانە: رۆژنامەی (پێشکەوتنی) ژمارە ٢٣ رۆژی ٢٣ی محرم ١٣٣٩ رێکەوتی ٣٠ی سبتمبری ١٩٢٠.

---

* مەجیدی حاجی فتح الله لە نیسانی ١٩٨٥دا کۆچی دوایی کرد.

٦٦-هیچ سەرچاوەیەك بەتەواوەتی ئەو ماوەیەی دەستنیشان نەکردووە کە کفری تیادا بەئازادی ژیاوە و لەژێر فەرمانڕەوایی برایم خانی شۆڕشگێڕدا بووە، باوکم** کە تەمەنی نەوەت ساڵ پترە و خوێندەوارێکی باشە مێژووی ئەو ڕۆژانەی لەبیرە ئەڵێت (ڕۆژی ١ی ذي الحجەی ١٣٣٨ی کۆچی برایم خان کفری ڕزگار کرد و نۆزدە ڕۆژ حوکمڕانی تیادا کرد) ئەمەش ئەکاتە نێوان (٢٢ی ئابی ١٩٢٠ تا ١٠ی ئەیلولی ١٩٢٠). دوو کەس لەپیاوە ناودارەکان و بەعومرەکانی دەلۆ ئەم ڕاستیەیان سەلماند یەکێکیان (کوێخا محمەدی ئەوڕەحمان کارێزیە ١٨٩٠ – ١٩٨٠) دووەمیان (مەلا سەمین فارس ١٩٠٠ – ١٩٨٤) مەلا سمین خوێندەوارێکی باش بوو پێش سەفەر بەر لەکفریدا گەیشتبووە پلەی (روشدیه – متوسطة).

٦٧-بڕوانە: ڕۆژنامەی (پێشکەوتن) ژمارە ٢١ ڕۆژی ٢ی محرمی ١٣٣٨ – ڕاستیەکەی ١٣٣٩یە- ئەڵێت (ناحیەی زەنگەنە دانراو عبدالکریم ئاغا کرا بە مودیر، مودیری قەرەتەپەش چوە سەر ئیش خۆی).

٦٨-(بەهجەت بابان) خۆی نەدا بەدەستەوە و لەبەرچاو وون بوو لەبەر (جەمیل بەگی) برای وازیان لێهێنا (محمد سعید) گیرا و تەحقیقی لەگەڵ کرا پاش چەند ڕۆژێك بەرەڵڵا کرا، کە چوونە سەر ماڵ (محمەدی حاجی نەعمان وەنداوی) ئابلۆقەی ماڵکەیاندا خەریك بوون ماڵەکەی تاڵان بکەن، سەیدەکانی کفری ڕزگاریان کرد.

٦٩-کە کەل و پەل و ناوماڵەی دەلۆییەکان ناوبازاڕ خرایە موزایەدەوە کەسێکی ناوشار نەچوونە بەرەوە، بەکرێ گیراوەکان لەناو خۆیاندا دابەشیان کرد.

---

** باوکم لە شوباتی ١٩٨٥دا کۆچی دوایی کرد.

٧٠-(باوه ئەحمەد) یەکێکە لە باوەکانی ڕێبازی کاکەیی، دەمێك بوو لە کفریدا بوو، وەجاغی هەبوو، ئەوی مار و دووپشك پێوەی بدایە یا هار بووایە ئەچوە وەجاغی باوە ئەحمەد، لەناو خەڵکدا پایە و مەقامی خۆی هەبوو، ئێستا (زەینەڵ)ی کوڕی باوەیە و سەرتاشیشە.

٧١- (بەهجەت بابان) خۆی نەدا بەدەستەوە و لەبەرچاو وون بوو لەبەر (جەمیل بەگی) برای وازیان لێهێنا (محمد سعید) گیرا و تەحقیقی لەگەڵ کرا پاش چەند ڕۆژێك بەرەڵلا کرا، کە چوونە سەر ماڵ (محمدی حاجی نەعمان وەنداوی) ئابلۆقەی ماڵکەیاندا خەریك بوون ماڵەکەی تالان بکەن، سەیدەکانی کفری رزگاریان کرد.

٧٢- کە کەل و پەل و ناوماڵەی دەلۆییەکان ناوبازاڕ خرایە موزایەدەوە کەسێکی ناوشار نەچوونە بەرەوە، بەکرێ گیراوەکان لەناو خۆیاندا دابەشیان کرد.

٧٣- (باوە ئەحمەد) یەکێکە لە باوەکانی ڕێبازی کاکەیی، دەمێك بوو لە کفریدا بوو، وەجاغی هەبوو، ئەوی مار و دووپشك پێوەی بدایە یا هار بووایە ئەچوە وەجاغی باوە ئەحمەد، لەناو خەڵکدا پایە و مەقامی خۆی هەبوو، ئێستا (زەینەڵ)ی کوڕی باوەیە و سەرتاشیشە.

٧٤- (جەمیل ئەکرەم کوڕی مستەفا ڕێژی) کە ئێستا تەمەنی لە هەشتا تێپەڕیوە ئەم کارەساتەی بۆ گێڕامەوە.

٧٥- (حاجی حەسەنی وەستا ئەحمەدی قەرەداغی) کە ئێستا تەمەنی لە حەفتا تێپەڕیوە ئەم ڕووداوەی بۆ گێڕامەوە.

٧٦- ڕۆژنامەی (پێشکەوتن) ژمارە (٢١)ی ١٤ی سبتمبر ١٩٢٠.

٧٧- ڕۆژنامەی (پێشکەوتن) ژمارە (٢٤) ٧ی ئۆکتۆبەری ١٩٢٠.

٧٨- ئەو حەلە ئاوایی (زەرداو) مەڵبەندی دوژمنان بوو، لەو گوندە کۆبوونەوە دژ بەشۆڕش ئەکرا.

٧٩- (عەین فارس) ئاواییەکی هۆزی دەلۆیە و کەوتووەتە سەر سنووری ئەوان و هۆزی لهێبەوە.

٨٠- قایمقامی کفری لەو حەلە (محمد خالصی کوڕی شێخ رەزای تاڵەبانی) بوو، محمد خالص شاعیر و سەر بەشێخ مەحمودی حەفید بوو.

٨١- ئێوارەی رۆژی ١٩٧٩/٨/٢٨ خوالێخۆشبوو (حاجی محمدی ئەورەحمان کارێزی) لە ئاوایی (کارێز) ئەم روداوەی بۆ گێڕامەوە کە خۆی لە رووداوەکەدا بووە.

٨٢- لەشەڕدا ئەوەندە ئازایەتی و نەبەردی و لەسەر بیروڕا سووربوون دەوری لە سەرکەوتندا هەیە کەم و زۆری ئەوەندە دەوری نییە، لەشەڕی (بەدر) هێزی دوژمن دە ئەوەندەی هێزی موسڵمانان بو، هێزی موسڵمان سەرکەوت، ڤیێتنام بەسەرژمێرێکی کەمەوە لەسەریەك سەرکەوتە سەر سوپا زۆر و مۆڵەکەی فەرەنسا و ئەمەریکا جا هیچ مایەی سەرسوڕمان نییە بەسێ کەسەوە زاڵ ببنە سەر سی کەسی بەکرێگیراو.

٨٣- لەم ئاواییانەدا تیرەی تەرخانی و رۆغزایی دائەنیشن ئەم دوو تیرەی جافە لەگەڵ برایم خان خزمایەتیان هەبوو لە شۆڕشەکەشیاندا هاوکاری یەك بوون.

٨٤- ساڵانی ١٩٤٤ — ١٩٤٦ لە کەلار مامۆستا بووم کەریم بەگی جاف خۆی ئەم رووداوەی بۆ گێڕامەوە و وتی: ئەو کەسەی کاغەزەکەی پیادا ناردووە (عەلی جەغەرە)ی ناو بووە.

٨٥- جاری یەکەم ئەوە بوو دانیشتووانی کفری داوایان لێکرد بکشێتەوە ئەویش لەشار کشایەوە و ئەمەش جاری دووەمە، چونکە ئەگەر دانیشتووانی ناوچەیەك پشتگیری شۆڕشگێڕان نەگرن بەرەنگاری کردن لەوناوە بەگران رائەوەستێت.

٨٦- ئەم ئاواییە کەوتووەتە سەر لێواری ئەو تەنگەبەرەی کە رووباری (قوڕی چایی) پیادا ئەڕوات، گوندەکەش هەر بەناو رووبارەکەوەیە و کەوتووەتە لاپاڵی شاخەکەوە، (قڕی چایی)یش بەتورکی مانای (خرە وشکە).

٨٧- رۆژی ١٩٧٩/٨/٢٦ کاك (شەرەف برایم خان) لە ئاواییەکەی خۆیدا ئەم بەسەرهاتەی دوا رۆژەکانی برایم خانی باوکی بۆ گێڕامەوە.

٨٨- بڕوانە: ابراهیم خان ثائر من کردستان، د. مکرم تاڵەبانی ١٩٧١، ل٩٩ — ١٠٠.

٨٩- رۆژنامەی (پێشکەوتن) ژمارە (٣٧) رۆژی ٢٦ی ربیع الآخر ١٣٣٩ رێکەوتی ٦ی جنوری ١٩٢١.

٩٠- ئەو خاڵانەی کە هۆزی بەنی جەحیم و سوپای بەریتانیا لەسەری رێککەوتبون ئەمانەی خوارەوە بوون:

١- حکومەتێکی سەربەخۆ لەعیراقدا دابمەزرێت.

٢- ئەو زەرەر و زیانەی لەم ناوچەیە لە حکومەت دراوە داوای بارمتەی لە هۆزی بەنی جەحیم نەکرێت.

٣- خەرج و باجی ساڵی ١٩٢٠یان لێ نەسەندرێت.

٤- خۆیان (هۆزەکە) پارێزگاری کردنی هێڵی شەمەندەفەری ناوچەی خۆیان بگرنە ئەستۆ.

٥- ئەمن و ئاسایشی ناوچەی خۆیان بەدەستیانەوە بێت.

٦- ئەو (٢٤٠٠) تفەنگەی کە لەحکومەت دەستیان کەوتبوو بیدەنە دواوە بەحکومەت.

٩١- لەناوچەی کفری و لەناو هۆزی دەلۆ بەو لێبوردنە بە (راوبەخت) ناوئەبرێت.

٩٢- عەلی کوڕی قاسم کوڕی مال الله یە، برازای موبارەك ئەفەندی و مستەفا رێژیە، عەلی غالب لە قومسریەوە سەرکەوت تا گەیشتە پلەی مودیری پۆلیس.

٩٣- ئـەو پەیوەندیـە تـا رۆژگـاری ئـەمڕۆش هـەر پـارێزراوە، سـاڵی ١٩٨٠ کـە هەڵبـژاردنی ئەنجومـەنی نیـشتمانی بـوو (کفـری و خـالص) یـەك ناوچەی هەڵبژارن بوو (هیدایت محمد عبدالرحمن دەلۆیی) خۆی لە کفریـەوە هەڵبـژاردبوو چـووە نـاو عـەزە و چـاوی بـە حـەبیب خـەیزەران کـەوت ئـەویش هـانی هۆزەکەیـدا کـە دەنگـی خۆیـان بـدەن بـە (هیدایـەت دەلـۆیی) ئـەوەبوو کـاك هیدایـەت بـوو بـە ئەنـدامی یکـەم ئەنجومـەنی نیـشتمانی (١٩٨٠ – ١٩٨٤).

٩٤- ئەو ئاوارە بوونە لە (٢٠ی ئەیلولی ١٩٢٠) وە تا حوزەیرانی ١٩٢١ی خایاند.

٩٥- جۆگـە ئاوێـك بـەناو شـاری کفریـدا تێئەپـەڕێ و بووەتـە سـنووری نێـوان دوو گەڕەکی (ئیسماعیل بەگ و سەیدەکان).

٩٦- بڕوانە: حرکة کفري، نووسینی (ئەرنۆڵد ویلسون) جێگـری حـاکمی گشتی لـە سەردەمی ئیحتیلالدا، وەرگێڕی – جعفر الخیاط، چ ١٩٧١، ل١١٦.

٩٧- ئەو بنکەیە بوو یەکانگایەك بۆ کۆبوونـەوە و جموجـۆڵی دوژمنـان، هێزەکـەی بەریتانیا لە کەرکوکەوە هەر لەوێوە هێرشیان بردە سەر کفری.

٩٨- بڕوانـە: دور الشعب الکردي في ثورة العشرین، د. کمال مظهـر أحمـد ١٩٧٨، ل١٤٨، ئویش لە رۆژنامەی (العراق)ی ژمارە ٣٠ی ئەیلول و ٧ ت ١٩٢٠/١.

٩٩- (عیسی عبدالقادر) لە یەکەم دێری چامەکەیدا وتویەتی

الاهبوا رفاقي واستفیقوا وکونوا کلکم متعاضدینا

(واتە: ئەی هەڤاڵەکانم راپـەڕن و راسـتەوەبن و هـەمووتان یـەك بگـرن و پـاڵ بدەن بەیەکەوە). (محمد مهدی بصیر) شاعیرێکی نابینا بوو بەشاعیری شۆڕشی بیست ناوبانگی دەرکردبوو.

١٠٠-(شەنگ باریك) و (هۆزتمان) نەوعە تفەنگێکی ئەو سەردەمە بوون، (جوامێر) یـەکێك بـوو لـە سـەرۆکە نەبـەردەکانی هـۆزی هەمەوەنـد، (داڵـە مێـز) نـاوی

چیایەکە (داڵ)یش پەلەوەرێکە بەلاشەی تۆپیو فێرە (پەلکەبڕان) واتە پرچ رنین.

١٠١- حەلیمە کچی عەلی دەروێشی دەلۆیی ساڵی ١٩٤٧ لە تەمەنی نەوەت ساڵیدا کۆچی دوایی کرد، ئەم ئافرەتە لە شەڕی بەرگری هۆزەکەیدا چەند جارێك بەشداری کردووە.

١٠٢- لە چلەکانەوە (ئیبراهیم عبدالباقی ١٩١٠) کوڕی نەعەنێر تا رۆژانی ئەمڕۆ لە خانەقیدا دانیشتووە و پەیوەندی لەگەڵ خزمەکانیدا پاراستووە.

١٠٣- بڕوانە: رۆژنامەی (العراق) ژمارە (٢١٠٦) رۆژی ٢٠٨٣/١/٦ (نعیمة الثائرة البطلة) نووسینی بەخامەی نووسەری ئەم کتێبە.

١٠٤- بڕوانە: ابراهیم خان ثائر من کردستان، د. مکرم تاڵەبانی ١٩٧١، ل٥٠.

١٠٥- (عەزیزی برایم خان) و (مەلا سمین فارس) و (حاجی محمدی ئەورەحمان) ئەم راستیەیان بۆ روون کردمەوە و دووپاتیان کرد.

١٠٦- بڕوانە (یادداشت)ی رفیق حیلمی بەشی دووەمی بەرگی یەکەم ١٩٥٦، ل١٠٧.

١٠٧- سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە ١٠٢.

١٠٨- کردەوەی (مشیری حەمەی مام سلێمان) لەکردەوە چەپەڵەکەی (ئیڤاڵت)ی ئیسپراطی ئەچێت، سوپای ئێران کە چوونە سەر یۆنان پاڵەوانەکانی ئیسپراطە بەسێ سەد کەسەوە دەربەندی (ئەرمۆبیلی)یان لێ گرتن و زەبر و زەنگی دوژمن نەیانی ترساند بوو، بەڵام (ئیڤاڵت)ی ئیسپراطی دزە رێگەیەکی لەپشت قورگی دەربەندەکەوە پیشان دوژمندا ئەوانیش لەو کەلەبەرەوە کردیانە ئەودیوەوە و لە پشتەوە هەڵیان کوتایە سەر رۆڵە نەبەردەکانی ئیسپراطە، لەو شەڕەدا یەکێك لەو سێ سەد کەسە دەرنەچوو هەموویان کوژران و دوژمن بەسەر لاشەکەیاندا رێگەی یۆنامنی بۆ تەخت بوو، ناوی (ئیڤاڵت) لەمێژوودا بوو بە پەڵەیەکی رەش و نموونەی خیانەت کردن.

## بەشی پێنجەم

## کفری پاش شۆڕشی برایم خان

پاش کوژاندنەوەی شۆڕشی شێخ مەحمود لە ساڵی ١٩١٩دا و شۆڕشی شارەکانی دوز و خانەقی و کفری لە ساڵی ١٩٢٠دا کوردستان کش و مات نەمایەوە بەڵکو ساڵانی ١٩٢١ و ١٩٢٢ لە هەرێمی کوردایەتی چەند شەڕ و شۆڕێکی چەتەگەری دژی سوپای بەریتانیای داگیرکەری تیادا روویدا، وەك.

١ سورچیەکان لە مانگی ئابی ١٩٢١دا ناوچەی باتاسیان گرت و فڕۆکەی بەریتانیا چووە سەریان و بۆمبارانی کردن.

٢- هۆزەکانی (پشدەر و بڵباس و ئاکۆ) ناوخۆیاندا یەکیان گرت و لە ئەیلولی ١٩٢١دا قەزای (رانیە)یان لەچنگ دوژمن رزگار کرد و ماوەیەك تیادا مانەوە.

٣- لەناوچەی هەورامان هێزەکانی - مەحمود خانی دزلی) لە کانونی دووەمی ١٩٢٢دا چووە سەر شاری (هەڵەبجە) و بەریتانیا بەفڕۆکە چووە سەریان و بلاوەی پێکردن.

٤ هۆزی (جەباری) بەسەرۆکایەتی (سید محمد) لە مایسی ١٩٢٢دا دژی بەریتانیا راپەڕی و (کەریمی فەتاح بەگی هەمەوەند)یش پشتگیری کردن و لە ١٩٢٢/٦/١٨دا کاپتن (بۆند)یان کوشت و زەرەر و زیانیان لە سوپای بەریتانیادا.

٥ هەر لەو ماوەیەدا (مەحمود بەگی کوڕی عوسمان بەگی دەلۆ) لە ناوچەی خانەقی راپەڕی و لەقەسری شیرین و خانەقی پەلاماری هێزەکانی بەریتانیایدا، کە حکومەتی عیراق چەسپا و مەلیك فەیسەڵ هاتە سەر حوکم دیسانەوە راپەڕی ئەمجارە بەدیل گیرا و دوورخرایەوە ناو دەلۆی دەورویشتی کفری تا ساڵی ١٩٣٥ کۆچی دوایی کرد.

٦ پاش بەدیل گرتنی شێخ مەحمود و دوورخستنەوەی، کوردستان باری ئاسایشی بەخۆیەوە نەبینی زۆربەی راپەڕینەکان بۆ گێڕانەوەی شێخ مەحمود بەرپا کرابوو لە ساڵی ١٩٢٢یشدا ئوزدەمیر[1] لە رەواندز سەریهەڵدا، کاربەدەستانی بەریتانی هیچیان بۆ نەمایەوە ئەوە نەبێت کە زوو بەزوو شێخ مەحمود بگێڕنەوە کوردستان و حوکمڕانی بۆ جێبهێڵن تا کورد بەهێمنیەوە حوکمی خۆی بگرێتە دەست.

## گەڕانەوەی شێخ مەحمود:

شێخ مەحمود لەدیلی رزگار کرا و لەرێگای کوێتەوە گەیشتە بەغداد لەوێوە بڕیاریدا بەسواری شەمەندەفەر بچێتە (کنگربان) و بەکفریدا تێپەڕی بچێتەوە سلێمانی، لە سلێمانی بۆ پێشوازی کردنی شێخ وەفدێك لەم کەسانە پێکهات (ئەحمەد توفیق و حەمەی ئەورەحمان ئاغا و عزەت بەگی جاف و مستەفا پاشای یامولکی) پێش ئەوەی شێخ بگاتە کفری بەرۆژێك وەفدەکەی گەیشتنێ.

لەمێژووی کفریدا رۆژی ٢١ی ئەیلولی ١٩٢٢ بەرۆژێکی پرشنگدار ئەژمێردرێ لەم رۆژەدا سەدەها کەس لە رۆڵەی هۆزەکانی ئەو ناوچەیە بەکورد و عەرەبەوە بەسواری وڵاغەکانیان و چەکی دەستیانەوە گەیشتنە ئێستگەی شەمەندەفەری (کنگربان) هەروەها دانیشتووانی شار بەپیادە و بەسوارییەوە بەتەپڵ و بەیداخەوە رژانە ناو ئێستگەکەوە، هەرکە شەمەندەفەر گەیشت و لەنگەری بەست و راوەستا و دیمەنی شێخ دەرکەوت و هاتە خوارێ دەنگی (الله اکبر) تێکەڵ بەتەقەی مارتلی و شریقەی ماوزەر و تەپڵ و دەف و دەهۆڵ و زورنا بوو، لەپێشدا وەفدی سلێمانی بەخێرهاتنی شێخیان کرد و ئینجا سید محسن ئاغای سەرۆکی ناودارەکانی کفری و سەرۆك هۆزەکانی ناوچە و دانیشتووانی شار یەك بەیەك ئەم دەستی ئەگوشێت

ئەویش ئەملا و ئەولای ماچ ئەکا. فرمێسکی شادی لەچاو هاتە خوارێ بەم چەشنە ڕۆڵەی کورد جارێکی تر باوەشیان بەسەرۆکە دڵسۆزەکەیانەوە کرد و لەدەوری کۆبوونەوە هۆزەکانی دەوروپشتی کفری بەکورد و عەرەب و تورکمانەوە هەموو هاتبوون و ناکۆکیان پێچابووە و خستبووە لاوە، شێخ سواربوو تەقە و ڕمبازێ دەستی پێکرد ئەو حەشاماتە ڕوویان کردە کفری سەعاتە ڕێگەکە بوو بەسێ سەعات، منداڵ و ئافرەت و پیاوە بەساڵاچووەکانیش لەقەراغ شار بە چەپڵە و هەڵهەڵە و الله اکبر پێشوازی شێخیان کرد و ئەو خەڵکە هەموو ڕوویان کردە ماڵ (سید محسن ئاغا)ی[٢] گەورەی ناودارانی شار[٣]. هەرچی دانیشتووانی شارە یەك بەیەك بەخێرهاتنی شێخیان کرد و بڵاوەیان لێکرد میوانەکانیش ئەو شەوە لەوێ مانەوە، شێخ لەماڵ محسن ئاغا ڕوانی برایم خانی لەناو ئەو خەڵکەدا نەبینی کە بیستی ئەمری خوای کردووە فرمێسکی چاوی بەفەقیانەکانی سڕی وتی: کە دیل بووم ئینگلیزەکان وتیان حاجی برایم ئاغا شۆڕشێکی بەرپا کردووە و داوای گەڕانەوەت ئەکات، زانیم هەبێ و نەبێ ئەمە برایم خانی خۆمانە، شێخ هەردوو کوڕەکانی برایم خان (عەزیز و شەرەف) بانگ کردە لای خۆی و ئەملا و ئەولای ماچ کردن و هەریەکە سەعاتێکی پێ بەخشین و ئامۆژگاری کردن کە ڕێڕەوی باوکیان بەرنەدەن.

پاش سێ ڕۆژ شێخ دوعا خوازی لە دانیشتووانی کفری کرد و لەشارەوە تاقمە سوارێك تا سەرقەڵا بەڕێیان خست، لەو سێ قۆناغە ڕێیە تا سلێمانی پۆل پۆل سوارە و پیادە لەسەر ئەو ڕێگایە وەستا بوون و بەخێرهاتنیان لە شێخ ئەکرد بەم شێوەیە لە ٣٠ی ئەیلولی ١٩٢٢دا شێخ گەیشتە سلێمانی هەموو دانیشتووانی شار بەگەورە و بچووك و پیاو و ئافرەتەوە لەپێشوازیدا بوون سەدای ئەو خەڵکە تێکەڵ بە شریقەی تفەنگ و دەنگی تەپڵ و هەڵهەڵەی ئافرەت بووبوو، سوپاس بۆ یەزدان وا خاکی کوردستان جارێکی تر بە

گەڕانەوەی ڕۆڵەی نەبەردی گەشایەوە و شێخ بەسەربەرزی گەڕایەوە پاش ماوەیەك حوكمی میللی دامەزرا و شێخ بوو بەحوكمدار و دوو سەرۆك هۆزی گەرمیان (عەلی حەسەن ئاغای زەنگەنە) و (ڕەفعەتی سمایل بەگی داودە)[٤] بەگەورەی یاودرانی شێخ دامەزران. ئەو سەرۆك هۆزانەی كە لەگەڵ شێخدا[٥] ناكۆك بوون ئەوانیش هاتنە خزمەتی و پاكانەیان بۆ كرد تاوەكو بۆ لەمەولا لاپەڕەیەكی نوێ بكەنەوە، ئینگلیزەكان لە نزیك بوونەوەی تاڵەبانیەكان لە شێخ مەحمود دلگیر بوون (ئەدمۆندسن) ئەمەی بەم چەشنە دەربڕیوە ئەڵێت (سێ كەس لە كوڕەكانی شێخ تالیبی تاڵەبانی ناوچەی گەرمیانمان چاو پێكەوت لای ئێمە لەوە زۆر شەرمەزاریان پیشاندا كە چوونەتە خزمەتی شێخ، بەڵێنیان بە ئێمەدا لە ڕۆژانی داهاتوودا هەر لەگەڵمان بن)[٦].

## كفری پاش شۆڕشی برایم خان:

پاش هەرەس هێنانی شۆڕشی برایم خانی دەلۆ هۆزی دەلۆ بەتایبەتی و شاری كفری بەگشتی كەوتە ناو جەرگەی لیستەی ڕەشی بەریتانیاوە و بارێكی یەكجار گەورەیان كەوتە سەرشان''، خووردوشتی ئەو جێگرانەی پاش (سلمنت) هاتنە كفری وەك (دۆگڵس، رایت، گاردن) ئەگەر لەوی پێشوویان خراپتر نەبووبن بەهیچ كلۆجێك لەو چاكتر نەبوون، ئەمەش كارێكی گەورەی كردە سەر شاری كفری و وەهای لێكرد بەرەو پاشەوە بگەڕێتەوە و ئەوەش لەمانەی خوارەوەدا دەرئەكەوێ:

١- ڕێگا كاروانی بەغدا بۆ سلێمانی كە بەسەر كفریدا ئەڕۆیشت گوێزرایە سەر كەركوك.

٢ لەسەردەمی عوسمانیدا لەكفری قوتابخانەیەكی متوسطە (روشدیە) هەبووە، لەسالآنی سیەوە دانیشتووانی شار ئەكۆشان و هەوڵیان ئەدا قوتابخانەیەكی ناوەندیان بۆ منداڵەكانیان بۆ نەئەكردەوە، حكومەتی دوابڕاوی سەر

بەبەریتانیا گوێی خۆی کەڕ کردبوو، ناچار دانیشتووان لەناو خۆیاندا بەپیتاك سێ هەزار دیناریان کۆ کردەوە و لەساڵی ١٩٤٩ قوتابخانەیەکی ناوەندییان دروست کرد.

٣ ئەو کانە فیرەی سەدەها تەن فیری تیا دەرئەهێنرا و دەیەها خێزانی بەخێو ئەکرد خرایە پشت گوێ و کوێرەوە بوو.

٤- تا شۆڕشی تەمموز لەناو شاری کفریدا راستە شەقامێکی قیرتاو کرا و نەبوو لەناوشاردا نەخۆشخانە و باخی گشتی و کارگەیەکی تیادا نەبوو.

٥- بەدرێژایی سەردەمی دوابڕاو زۆرانبازی نێوان دوو بنەماڵەی ناوداری شار (بابان) و (وەنداوی)ەکان بۆ ئەندامیەتی پەرلەمان و سەرۆکی شارەوانی چوونە سەر کورسی وەزارەت هەبوو هەردوو بنەماڵەکە بۆ خزم و کەس و کار و دەست و پێوەندی خۆیان بەولاوە خزمەتێکیان پێشکەش شارەکە خۆیان نەکرد.

هۆزی (دەلۆ)یش کە ئەرکی هەڵگیرساندنی شۆڕشی کەوتبووە سەرشان بەجارێك لەلایەن کاربەدەستانی سەردەمی دوابڕاودا ئافەرۆز کرابوو، رێگە نەئەدرا قوتابخانە و نەخۆشخانە لە ئاواییەکانیاندا بکرێتەوە رێگە بەڕۆڵەکانیان نەئەدرا فرمانی گەورە و مام ناوەندی میریان پێ بدرێت، زۆربەی زۆری ئەو نەرزەی ئەیانکێڵا بەمولکایەتی هی گەورەی هۆزەکانی دیکەبوو، زۆربەی جووتیار و کاسبکار و رۆشنبیری ئەم هۆزە بەدەم دەردەوە ئەتلانەوە بەڵام ملیان بۆ چەوسێنەر شۆڕ نەئەکرد.

## ئەمڕۆ رۆژی رێزگرتنی شۆڕشگێڕانە:

شاری (کفری) بەسەرۆکایەتی (برایم خان) دژی بەریتانیای داگیرکەر شۆڕشی بەرپا کرد، ئینگلیزەکان تا لەعیراقدا لە سەرکاردا بوون رێگەیان نەئەدایە هۆزی دەلۆ ببوژێتەوە و نەکفریش وەك شارانی تر پێش بکەوێ، پاش ئەوەی

شۆڕشی تەممووزی ١٩٥٨ و شۆڕشی حەڤدەی تەممووزی ١٩٦٨ بەرپا بوون ئەم شارەش بەرەو پێشەوە هەنگاوی نا بەڵام وەك شارێکی شۆڕشگێڕ چاوی لەوەیە لەمەولا لەلایەن شۆڕشگێڕانەوە لەم بوارانەدا ڕێزی بگیرێت و ئاواتی بێتە دی:

١- کاروانە ڕێگەکەی جاران کە لەسلێمانییەوە یەك راست ئەهاتە کفری —ئەچووە خالص کورتترین ڕێگەیە بۆ بەغداد چونکە لە هیچ ئاو و ڕووبارێك نادات و هەرێمێکی پان و بەرینی وەك قەرەداغ و ناو جاف و دەوروپشتی قەرەتەپە و خالصات زیندوو ئەکاتەوە، تەخت کردن و قیرتاو کردنی ئەم ڕێگەیە کەلەپورێکی کۆنمان بۆ زیندوو ئەکاتەوە و ڕێگەی دووریشمان بۆ نزیك ئەکاتەوە.

٢- دروست کردنی ئاوبەستێك لای تەنگەکەی پشت شاخی باوە شاسوار ئەبێتە هۆی کۆکردنەوەی ئاوی دوو ڕووبار و باراناوی ئەو ناوچەیە لە هاویناندا دەشتێکی پان و بەرینی دەیمەکاڵی پێ ئاوەدان ئەکرێتەوە.

٣- دەرهێنانی قیری ناصالح و بەکارهێنانی وەك هێزێکی یەدەك لەپاڵ سامانەکانی تری نەتەوایەتیدا.

٤- ئەو شوێنەوارە دێرینانەی کە لەدەوروپشتی شاردا هەیە لەلایەن شوێنەوارناسانەوە نیشان بکرێت و لێی بکۆڵێتەوە و مۆزەخانەیەکیان بۆ دابنرێت.

٥- پەیکەرێك بۆ (برایم خانی دەلۆ)(٧) لەناو شاردا دروست بکرێت.

٦- ناوی یەکێك لە شەقامەکانی کفری و یەکێك لەقوتابخانەکانی بەناو برایم خانەوە ناو بنرێت.

٧- مەزارگەی برایم خان بەجۆرێکی شایستەی نەبەردی ئەو پاڵەوانە بێت هەڵبگیرێت و گومەزی لەسەر دروست بکرێت.

٨- تێڕوانینێکی گشتی بکرێتە سەر ئەو شوێنانەی کە شۆڕشەکەی برایم خانی تیادا ڕوویداوە وێنەیان بگیرێت و دەنگی ئەو بەساڵاچووانە تۆمار بکرێت کە بەشداریان تیادا کردووە وەیان بەچاو بینیویانە، هەندێ لەو چەك و ئامێرانە لە مۆزەخانەیەکدا(٨) بپارێزرێت کە لەم شارەدا دروست بکرێ.

**لیستەی ناوی قائمقامەکانی( ۹ ) شاری کفری پاش شۆڕشی برایم خان:**

١- محمد خالصی تاڵەبانی ١٩٢١ — ١٩٢٢.

٢- بەهجەت هورمزی ١٩٢٢ — ١٩٢٤.

٣ مەحمود فەخری ١٩٢٥ — ١٩٢٦.

٤- حاجی توفیق ١٩٢٧ — ١٩٢٩.

٥ ماجد مستەفا ١٩٣٠ — ١٩٣١.

٦- حسین عەونی ١٩٣١ — ١٩٣٢.

٧ مستەفا یەعقوبی ١٩٣٢ — ١٩٣٤.

٨ نوری سعێدی ١٩٣٤ — ١٩٣٥.

٩- جەمیل روحی ١٩٣٥ — ١٩٣٧.

١٠ حیکمەت زەهاوی ١٩٣٧ — ١٩٣٩.

١١- ناجی هورمزی ١٩٣٨ — ١٩٤٠.

١٢ سەعید قەزاز ١٩٤٠ — ١٩٤١.

١٣ جەودەت محمد عەلی ١٩٤١ — ١٩٤٢.

١٤- ئەمین فیردار ١٩٤٢ — ١٩٤٣.

١٥- رەمزی فەتاح ١٩٤٤ — ١٩٤٦.

١٦- ئیسماعیل حەقی رەسول ١٩٤٦ — ١٩٤٩.

١٧ سامی عەلی ١٩٤٩ — ١٩٥٠.

١٨- حسین عەونی ١٩٥٠ — ١٩٥١.

١٩- خەلیل زێدان ١٩٥١ — ١٩٥٢.

٢٠-حیکمەت ئەمین هاشمی ١٩٥٢.

٢١ عبدالقادر حەیدەری ١٩٥٢ — ١٩٥٤.

٢٢-عومەر محمد ئاغا ١٩٥٥ — ١٩٥٧.

٢٣-محمد عەلی زوێن ١٩٥٧ — ١٩٥٨.

٢٤- بايز عەزيز دزەيى ١٩٥٨ -- ١٩٥٩.

٢٥-عومەر ميران ١٩٥٩ — ١٩٦٠.

٢٦-بهاء حسينى ١٩٦٠ — ١٩٦١.

٢٧-محمد عەلى شێخ ١٩٦١ — ١٩٦٢.

٢٨-عبدالمجيد قەرەغولى ١٩٦٢ — ١٩٦٣.

٢٩-عبدالصاحب غەرباوى ١٩٦٣.

٣٠-رەشيد بەدرى ١٩٦٤ — ١٩٦٥.

٣١- محى الدين عبدالرزاق ١٩٦٥.

٣٢- حمادى ربيعى ١٩٦٦ — ١٩٧٠.

٣٣-عيصام طلعت ١٩٧٠ — ١٩٧٥.

٣٤- داود سەلمان ١٩٧٥ -- ١٩٧٧.

٣٥-شاكر ئەحمەد قطمير ١٩٧٧ — ١٩٧٩.

٣٦-كاظم بريسن سلمان ١٩٨٠ — ١٩٨٥.

٣٧-ناجى غزعل زيدان العبيدى ١٩٨٥.

**ليستەى ناوى سەرۆكى شارەوانى**

١. عثمان محمد ئاغا

٢. سەعيد وەنداوى

٣. سەيد عومەر ئاغا ١٩٢٥ — ١٩٢٥

٤. محمد حاجى نوعمان

٥. سيد عبدالله ئاغا

٦. عبدالكريم عەلى گوڵناز

٧. جەميل ئەكرەم مستەفا

٨. عباس عبدالقادر

٩. عەتا جەمال تاڵەبانى

**ناوی بەڕێوەبەرانی قوتابخانەی سەرەتایی کفری:**

١. هارون رەشید ١٩٢٠.
٢. ئەحمەد حەمدی ١٩٢١ — ١٩٢٣.
٣. جەمیل مەدفەعی صالح ١٩٢٣ — ١٩٢٤.
٤. رەشید زەکی کابان ١٩٢٥.
٥. محمد فائق ١٩٢٦.
٦. سەعید بەسیم ١٩٢٧.
٧. رەشید عاکف هورمزی ١٩٢٨ — ١٩٣٥.
٨. محمد حماسی ١٩٣١.
٩. ئیسماعیل حەقی ١٩٣٣.
١٠. فاتح مستەفا ١٩٣٦.
١١. سەعید بەسیم ١٩٣٧.
١٢. عبدالحکیم مستەفا رێژی ١٩٣٩.
١٣. مەجید نەجم ١٩٤٠ — ١٩٤١، ١٩٤٥ — ١٩٥٩.
١٤. خورشید محمد عەلی داودی ١٩٤١ — ١٩٤٤.
١٥. خالد سەعید مفتی ١٩٥٩ — ١٩٦٣.
١٦. محمد رەشید سەحەر ١٩٦٣ — ١٩٧٠.
١٧. محمد حسن صالح ١٩٧٠.

سالی ١٩٣٨، قوتابخانەی سەرەتایی دووەم لە کفری کرایەوە لە بەڕێوەبەرەکانی: (ئەحمەد حەمدی سیرەت، خورشید ئەحمەد، حسن عەباس رەزا، بەهجەت فەتاح وەنداوی، محمد قادر ئەحمەد، ئەحمەد محمد قەرەداغی، رفعەت مەدحەت، خورشید عزیز).

سالّی ١٩٥٨ – ١٩٥٩ قوتابخانەی سێیەمی سەرەتایی لە کفری کرایەوە، لە بەڕێوەبەرەکانی: (غەریب دەروێش، عبدالعزیز راغب، حەسەن عەباس رەزا، عبدالباقی حاجی سەمین).

سالّی ١٩٣٢ یەکەم قوتابخانەی سەرەتایی بۆ کچان کرایەوە، ناوی قوتابخانەکانی کفری لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا:

١. ئامادەیی (المکاسب) بۆ کوڕان.
٢. ناوەندی (ام القری) بۆ کچان.
٣. ناوەندیەکی ئێواران.
٤. قوتابخانەی (المکارم)ی سەرەتایی بۆ کوڕان.
٥. قوتابخانەی (المحاسن)ی سەرەتایی بۆ کوڕان.
٦. قوتابخانەی (الخلود)ی سەرەتایی بۆ کوڕان.
٧. قوتابخانەی (الغفران)ی سەرەتایی بۆ کوڕان.
٨. قوتابخانەی (الشهداء)ی سەرەتایی بۆ کچان.
٩. قوتابخانەی (المهج)ی سەرەتایی بۆ کچان.
١٠. قوتابخانەی (رابعة العدویة)ی سەرەتایی بۆ کچان.
١١. قوتابخانەی (حنان)ی سەرەتایی بۆ کچان.
١٢. باخچەی مندالّانی ١٧ی تەمموز.

لە حەفدەی تەممووزی ١٩٧٨دا کارگەیەك بۆ رستن و شوشتن و بۆیە کردنی خوری لەکفری کرایەوە لەم کارگەیەدا (١٤٠) کرێکاری نێر و مێ کار دەکەن، توانای کارگەکە (٤٨٩) تەنە لە خوری شۆراو (٤٥٠) تەن لە رستنی بۆیە کراوە.

## پەراوێزەکانی بەشی پێنجەم:

١- ئۆزدەمیر -واتە (ڕۆبیتەن – تەن ئاسنین)، ناوی (عەلی شفیق) و ئەفسەرێکی تورك بوو لە ٢٢ی حوزەیرانی ١٩٢٢دا بەهێزێکی کەمەوە ڕەواندزی گرت و خەریك بوو سنووری دەسەلاتی بگاتە سنووری سلێمانی و مەترسی بخاتە ناوچەکەوە.

٢- ئەو دیوەخانەی شێخ مەحمودی تیا میوان بوو وەك خۆی بەپێوە وەستاوە زەبر و زۆری زەمانە کاری تێ نەکردووە، ئێستا کوڕەزای سید محسن ئاغا (تالیبی عبدالله ئاغا)ی تیادایە، پارێزەر کاك تالیب توانیویەتی چەند کەلەپورێکی باپیری بپارێزێت وەك، چرا و سەماوەر و ئامێری عەرەبانەکەی و چەند کریستاڵ و دەست خەت و فەرمانی ئەو سەردەمەی خۆیان.

٣- گەورەی ناوداران – ئەوسا پێی ئەوترا (نقیب الاشراف).

٤- بڕوانە – ڕۆژنامەی (ڕۆژی کوردستان) ساڵی یەکەم، ژمارە سێ، ١٥ی کانونی یەکەمی ١٩٢٢.

٥- وەك کوڕانی شێخ حەمید تاڵەبانی (وەهاب و عەلی و طالب و ڕەشید) هەروەها (فیض الله و قادر) بڕوانە سەرچاوەی پێشوو ڕۆژی ٢٧ی کانونی یەکەمی ١٩٢٢.

٦- بڕوانە: کورد، تورك، عەرەب، ئەدمۆندسن، ێ ١٩٧١ (عەرەبی)، ل٢٨٠,.

٧- وەك، ئەو پەیکەرەی لەشاری (نەجەف) بۆ شۆڕشگێڕانی ساڵی بیست دروست کرا، ئەو پەیکەرە بریتیە لە کەوانێکی گەورەی (١٢٥) مەترەیی، شارەوانی نەجەف (٣٥٠) هەزار دیناری تیادا سەرف کردووە.

٨- لە قەزای (رمیثە)ی مەڵبەندی شۆڕشی بیست لەلایەن دەزگای شوێنەوار ناسینەوە مەسحێکی ئەو شوێنانەکرا کە شۆرشەکەی تیادا هەڵگیرسا، بڕوانە: ڕۆژنامەی (العراق) ژمارە (١٢٤٨) ڕۆژی ١٤ی مایسی ١٩٨٠.

٩- ڕۆژی ١٩٧٩/٧/١٨ ئەم لیستەیەم لە مامۆستا (حەسەن عەباس ڕەزا) وەرگرت کە ئێستا خانەنشینە و لە بەغداد دائەنیشێت و بیرەوەریەکی باشی هەیە و زۆر سوپاسی ئەکەم.

## سەرچاوەکانی ئەم کتێبە

یەکەم: ئەو کتێبانەی کەڵکم لێ وەرگرتوون:

### کتێبە کوردیەکان:


١. چیم دی، ئەحمەد خواجە، ١٩٧٠.
٢. دیوانی شێخ رەزای تاڵەبانی، ١٩٤٦.
٣. یادداشت، رەفیق حیلمی، ١٩٥٧.


### کتێبە تورکیەکان:


١. جوغرافیای عوسمانی ١٣٢٩هـ .
٢. قاموس الاعلام ١٨٩٦م.
٣. ساڵنامەی موصل ١٣١٠ – ١٣١٢هـ .


### کتێبە عەرەبیەکان:


١. الجغرافية العمومية للمدارس الثانوية والعالية المصرية ١٩٢٣.
٢. تأريخ القضية العراقية، محمد مهدي البصير ١٩٢٣.
٣. تأريخ العشائر الكردية، عباس العزاوي ١٩٤٧.
٤. رحلة المنشى البغدادي، ترجمة عباس العزاوي ١٩٤٨.
٥. أربعة قرون من تأريخ العراق –لونگريك- ترجمة جعفر الخياط ١٩٤٩.
٦. الداودية ماضيها وحاضرها، د. غالب الداودي ١٩٥١.
٧. الثورة العراقية الكبرى، عبدالرزاق الحسني ١٩٥٢.
٨. الحقائق الناصعة في الثورة العراقية، فريق مزهر الفرعون ١٩٥٢.
٩. تأريخ السليمانية وأنحائها، محمد امين زكي، المترجم ١٩٥١.
١٠. الشرفنامه –شرفخان البدليسي- ترجمة جميل الروزبياني ١٩٥٣.
١١. عشائر العراق العربية، عباس العزاوي، ١٩٥٥.

١٢. خمسة وخمسون سنة من تأريخ العراق ١٣٧١هـ .
١٣. ثورة العراق، حسين مروة ١٩٥٨.
١٤. الثورة، مقدماتها ونتائجها د. نوري جعفر ١٩٥٨.
١٥. تقرير سري لدائرة الاستخبارات البريطانية، ترجمة عبدالجليل الظاهر ١٩٥٨.
١٦. موجز تأريخ التركمان في العراق، شاكر صابر الضابط ١٩٦٠.
١٧. خلاصة تأريخ الكرد وكردستان، محمد امين زكي، ترجمة محمد علي عوني، ط٢ / ١٩٦١.
١٨. حرب العراق، شكري محمود نديم ١٩٦٤.
١٩. رحلة إلى مواطن الحضارة والآثار، الرحلة السادسة، طه باقر وفؤاد سفر ١٩٦٥.
٢٠. رحلة نيبور إلى العراق – ترجمة محمود حسين الأمين ١٩٦٥.
٢١. ثورة العراق –الفريق المرهولدن- ترجمة فؤاد جميل ١٩٦٥.
٢٢. القاموس السياسي، ط٢، أحمد عطية ١٩٦٨.
٢٣. رحلتي إلى العراق، جيمس بكنغهام، ترجمة سليم طه التكريتي ١٩٦٨.
٢٤. الأكراد، ملاحظات وانطباعات، مينورسكي، ترجمة د. معروف خزندار ١٩٦٨.
٢٥. رحلة إلى أبي طالب خان، ترجمة مصطفى جواد ١٩٦٩.
٢٦. رحلة متنكر إلى بلاد ما بين النهرين –صون- ترجمة فؤاد جميل ١٩٧٠.
٢٧. كرد وترك وعرب –ادموندس- تعريب ١٩٧١.
٢٨. مذكرات ويلسن، ترجمة جعفر الخياط ١٩٧١.
٢٩. موجز تأريخ البلدان العراقية، عبدالرزاق الحسنى، ط٢ – ١٩٧١.
٣٠. ابراهيم خان ثائر من كردستان، د. مكرم الطالباني ١٩٧١.
٣١. ثورة العشرين الوطنية التحررية –كاتلوف- ترجمة د.عبدالواحد كرم ١٩٧١.

٣٢. قضاء خانقين —دراسة في جغرافية السكان، رسالة ماجستير، خليل اسماعيل محمد ١٩٧٣.

٣٣. ولاية الموصل — دراسة في تطوراتها السياسية ١٩٠٨ — ١٩٢٢، رسالة ماجستير خليل ابراهيم محمد ١٩٧٥.

٣٤. كردستان خلال سنوات الحرب العالمية الأولى، د. كمال مظهر احمد، ترجمة محمد الملا عبدالكريم ١٩٧٥.

٣٥. ثورة العشرين في الاستشراق السوفيتي، د. كمال مظهر احمد ١٩٧٧.

٣٦. أسرار عراقية في وثائق انكليزية، محمود شبيب ١٩٧٧.

٣٧. حول مسألة الاقطاع، ع — شاميلوف، ترجمة د. كمال مظهر احمد ١٩٧٧.

٣٨. دور الشعب الكردي في ثورة العشرين العراقية، د. كمال مظهر احمد ١٩٧٨.

٣٩. لمحات اجتماعية في تأريخ العراق، د. علي الوردي، ج ٥ قسم ٢، ١٩٧٨.

٤٠. العشائر الكردية، ترجمة فؤاد حمه خورشيد ١٩٧٩.

### ئەو رۆژنامە و گۆڤارانەی کەڵکم لێ وەرگرتوون:

١. رۆژنامەی (العراق) ١٩٢٠ — بەعەرەبی.

٢. رۆژنامەی (پێشکەوتن) ١٩٢٠ — بەکوردی.

٣. رۆژنامەی (الموصل) ١٩٢٠ — بەعەرەبی.

٤. رۆژنامەی (الاستقلال) ١٩٢٠ - بەعەرەبی

٥. رۆژنامەی (بانگ کردستان) ١٩٢٢ - بەکوردی

٦. گۆڤاری (دەنگی گێتی تازە) ١٩٤٥ — ١٩٤٦ بەکوردی

٧. گۆڤاری (الاخاء) ١٩٧١ - بەتورکمانی

٨. گۆڤاری (کۆڕی زانیاری کورد) ١٩٧٣ بەکوردی

٩. رۆژنامەکانی (التآخي — العراق) بەعەرەبی.

**ئەو کەسانەی کەڵکم لیٚ وەرگرتوون:**

١. کاکەمەند ئەمین دەروێش- دانیشتووی ئاوایی (گلابات)ی سەر بەقەزای کفری – ساڵی ١٩٤٥ – لەتەمەنی ١١٠ ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە.

٢. محمد مەلا ئەمین (حمه عاصه) – دانیشتووی ئاوایی (گلابات) – ساڵی ١٩٧٥ لە تەمەنی نەوەت ساڵی کۆچی دوایی کردووە.

٣. رەزا ئەمینی دەلۆیی (رەزا بەگ) دانیشتووی )خانەقی) لە ساڵی ١٩٧٥دا لە تەمەنی حەفتا ساڵی کۆچی دوایی کردووە.

٤. عبدالباقی حاجی ئەحمەد (١٩١٠ – ١٩٧٩) خەڵك كفریە و دانیشتووی بەغدا بووە.

٥. محمد عبدالرحمن کاریٚزی (حاجی محەمەدی کوێخا ئەورەحمان ١٨٩٠ – ١٩٨٠).

٦. فتح الله بەگ احمد بەگ (فتح الله بەگی دەلۆ ١٩٧٨ – ١٩٨٠).

٧. سەمین فارس دەلۆیی (١٩٠٢ – ١٩٨٤).

٨. محمد پەریزاد گلی (١٩٠٥ – ١٩٨٤) کەرکوك.

٩. سید احمد شێخ محمد (١٨٨٩) دانیشتووی شاری کفری.

١٠. جمعه عەلی شەریف (١٨٩٤) دانیشتووی خانەقی.

١١. حسین رۆستەم سەعید (١٨٩٧) دانیشتووی کەلار.

١٢. فتح الله احمد قادر (١٨٩٧) دانیشتووی کەلار.

١٣. محمد صالح حمه خورشید داوده (١٨٩٨) دانیشتووی دوزخورماتوو.

١٤. ابراهیم صالح صوفی (١٨٩٨) دانیشتووی سەرقەڵا.

١٥. مجید حاجی فتح الله دەلۆیی (١٩٠٦ – ١٩٨٥) دانیشتووی ئاوایی (گلابات).

١٦. ماوەرز محمد ئیسماعیل (١٩٠٨) دانیشتووی خانەقی)

١٧. جەمیل ئەکرەم مستەفا رێژی (١٩٠٨) دانیشتووی بەغداد، خەڵکی کفریە.

١٨. ناظم محمد سعید وەنداوی (١٩١٠) دانیشتووی بەغداد – خەڵکی کفریە.

١٩. ابراهيم عبدالباقى (١٩١٠) دانيشتووى خانەقى – خەڵكى كفريە.

٢٠. شەرەف برايم خان (١٩١٠) دانيشتووى كفرى – كوڕى برايم خانە.

٢١. حەسەن عەباس رەزا (١٩١٢) دانيشتووى بەغداد – خەڵكى كفريە.

٢٢. بەهجەت فەتاح وەنداوى (١٩١٣) دانيشتووى كفرى.

٢٣. سامى عەلى وەيسى بەگ ١٩٢٤ دانيشتووى كفرى.

## چەند پەیڤێك بۆچاپی دووەمی ئەم کتێبە

ئێمە لە وولاتێکدا لە دایك بووین کە سەرباری ئەوەی رژێمە سەردەست و حوکمڕانەکانی کوردستان دەیانویست هەموو مۆرك و سیمایەکی کوردانەی ئەم نەتەوە و نیشتمانە بسڕنەوە لە پاڵ ئەوەشدا هەوڵیان دەدا مێژووەکەی بشێوێنن و بەهیچ کلۆجێك مێژووی کورد دیار نەبیت و نەنوسرێتەوە ، بەلاّم خۆشبەختانە ئەم میللەتە کۆڵنەدەرە خاوەن پێنوس و رێبواری ماندوو نەناسی ئەو کاروانە لە شوێنە جیا جیاکانی کوردستاندا هەلکەوتوون و جوامێرانە پێنوسەکانیان خستوەتە کار تاکو ئەو مێژووانە وون نەبن ، ئەم کتێبەی بەردەستتان مشتێکە لە خەرواری بەرهەمی ئەو کەسانەی کە تەنها و تەنها لە پێناوی زیندوو راگرتنی مێژووی کورد شەو و رۆژیان خستوەتە سەریەك و تێکۆشاون و هەستیان بە ماندوو بوون نەکردووە ، ئەگەر تەماشای ناوی مێژوونووسە بەناوبانگەکانی کورد بکەین دەبینین زۆربەی هەرە زۆریان لە بنەڕەتدا پیشەیان مێژوو نوسین نەبووە بەلاّم هەست کردن بە بەرپرسیاریەتیان بەرامبەر بە نەتەوەکەیان بە شێوەیەکی ئەکادیمی و پسپۆڕیەکی زۆرەوە کەوتونەتە تۆمار کردنی مێژوو ، نەوەکانی دوای خۆیان قەرزارن بە تەقەلا و پێنوسی ئەوان تەنها دانەوەی قەرزەکانیان بەوەیە کە بەردەوام بن لە سەر رێبازەکەیان کە فەرامۆش نەکردنی مێژووە.

مستەفا نەریمان ( رۆحی شاد ) من دەزانم بۆ نوسینی ئەم کتێبە چەند ماندوو بوو چەند سانسۆریان خستە سەری تاکو ئەم کتێبە تۆمار نەکات بەلاّم لە هەرەتی لاوییەوە خولیای ئەوە بوو ئەم مێژووە بنوسێتەوە و کۆڵی نەدا تاکو بە مەراز و ئامانج گەیشت ، بۆیە دەڵێم بۆ دووبارە لە چاپ دانەوەی ئەم کتێبە لە گۆڕیشدا رۆحی بێگەردی ووشە بە ووشە دەست خۆشی دەکات لە شێخ محەمەد شاکەلی ئەوانەی کە بەم کارەوە ماندوو بوون .

لێرەدا بە ئەرکی سەر شانی خۆمی دەزانم درووود و سڵاو بۆ گیانی پاکی مامۆستا مستەفا نەریمان بنێرم کە لاپەڕەیەکی پرشنگداری بۆ مێژووی گەرمیان و کورد تۆمار کرد و زۆر سوپاسی بەڕێز دکتۆر مکرم تاڵەبانی و بەڕێز دکتۆر کەماڵ مەزهەر ئەحمەد دەکەم کە نەیانهێشت ئەو مێژووە وون بێت داوای تەمەن درێژیان بۆ دەکەم ، دەست خۆشی لەو بیرمەند و خاوەن قەڵەمانە دەکەم کە لەسەر ئەو بابەتەیان نوسیوە و دەوڵەمەندیان کرد خوایە نمونەیان زۆر بێت .

جێگای خۆیەتی سوپاسی بەڕێز شێخ محەمەد شاکەلی وەزیری ئەوقاف و کارو باری ئاینی لە حکومەتی هەرێمی کوردستان بکەم کە ئەرکی لە چاپ دانەوەی ئەم کتێبەی لە ئەستۆ گرت و پەیکەرێکی بۆ مامۆستا مستەفا نەریمان لە شاری کفریدا دروست کرد و بەردەوام قەڵەمەکەی شەکەت بوون نازانێ و لە خزمەتکردن بەردەوامە ، خوای گەورە مۆفەقی کات و تەمەن درێژ بێت بۆ خزمەتکردنی نەتەوەکەی کە کار و پیشەی ساڵەهای ساڵی خۆی بنەماڵە بەڕێزەکەیانە .

من ئێژم : باشتر وایە ئەمڕۆ نەك سبەینێ بکەوینە کۆکردنەوەی پەلو پۆ و رەگ و ریشەی مێژوو بێ نازی میللەتەکەمان چونکە چەند زوو بکەین هێشتا هەر درەنگ کەوتووین .

ئیسماعیل عەزیز برایم خانی دەلۆ

رێبەندانی ٢٧٠٧ کوردی

# ناوەڕۆك

## بەشی چوارەم

## بەشی پێنجەم